فەهیمە ئەرژەنگی ـــ مەسعود لەعلی

# دوای زێڕ مەکەوە
# زێڕین بە





## جوانترین کورتە چیرۆکەکان بۆ دروستکردنی ژیانێکی باشتر

وەرگێڕانی: بەرهەم ئاودەشتی

# دوای زێڕ مەکەوە زێڕین بە

**جوانترین کورتە چیرۆکەکان بۆ دروستکردنی ژیانێکی باشتر**


نووسینی

فەهیمە ئەرژەنگی – مەسعود لەعلی

وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی



چاپی یەکەم

٢٠١٤

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە(٤٩٠)**

**ناسنامەی کتێب**

- ناوی کتێب: دوای زێڕ مەکەوە زێڕین بە٢.
- نوسینی: مەسعود لەعلی
- وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی
- بابەت: سەرکەوتن، دەروونزانی، دروستکردنی کەسایەتی، چیرۆك.
- بەرگ: فواد کەولۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی: (١١٦٧)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.**

ناونیشان:

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست

# چیرۆکی سەرکەوتن

خاخامێك لەناو خەڵکدا زۆر خۆشەویست بوو، هەموویان دەکەوتنە ژێر کاریگەریی وتەکانییەوە جگە لە ئیسحاق کە هەمیشە دژایەتی تەفسیرەکانی دەکرد و هەڵەکانی بیر دەهێنایەوە. ئەوانیتر لە ئیسحاق تورە دەبوون بەڵام هیچیان لەدەست نەدەهات.

سەرەنجام ئیسحاق مرد: لە مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەیدا، خەڵکی بۆیان دەرکەوت کە خاخام زۆر دڵتەنگە بۆی.

یەکێك وتی: بۆچی ئەوەندە دڵتەنگیت؟ خۆ ئەو هەمیشە رەخنەی لێ ئەگرتیت!

خاخام لە وەڵامدا وتی: من بۆ ئەو هاورێیە نارەحەت نیم کە هەنوکە لە بەهەشتە.

بۆ خودی خۆم نارەحەتم: لەکاتێکدا کە هەمووان رەخنەیان لێدەگرتم، ئەو رووبەرووم دەبووەوە و ناچار بووم بەرەو پێش بچم. ئێستا کە ئەو رۆیشتووە، لەوانەیە لە گەشەکردن بوەستم.

## سەرنج

دکتۆر عەلی شەریعەتی دەڵێت:

(قەت هیچ شتێك لەو کەسە فێر نەبووم کە هاورا بووە لەگەڵمدا).

# مۆدێلی پەیژەی سەرکەوتن

هێنانەکایەی گۆڕان و وەرچەرخانی پۆزەتیڤ لە ژیانی تاکەکەسی و سەرکەوتن بەسەر پەیژەی سەرکەوتندا، ئاواتی هەموو کەسێکە. بەڵام بۆئەوەی بە سەلامەتی، پلیکانەکانی ئەو پەیژەیە ببڕێت دەبێ ئەو مەرجانەی خوارەوە رەچاو بکەیت:

ئەلف) نابێ لەسەر هیچ کام لە پلیکانەکان زۆرتر لە رادەی ئاسایی بمێنیتەوە.

ب) پاش بڕینی پلیکانەی یەکەم؛ نۆرەی پلیکانەی دووەم دێت.

ج)نابێ سوود لە پەیژەیەك وەربگریت کە ستوونەکانی شکاوە.

د)دەبێ سەرەتا شوێنپێت قایم بکەیت و پاشان هەنگاوی دواتر هەڵێنیت.

هـ)پاش سوودوەرگرتن لە پەیژەکە، نابێ بەریبدەیتەوە.

بەڵام پەیژەی سەرکەوتن شەش پلیکانەی هەیە کە ئەگەر بە رێك و پێکی بەسەریدا سەرکەوتبێتیت و مەرجەکانت رەچاو کردبێت، پەیتا پەیتا دەتگەیەنێتە سەرکەوتن و کامەرانی.

## پلیکانەی یەکەم: خۆناسین و باوەڕ بەخۆبوون

لێرەدا دەبێ تۆ گوێ لەو بانگانەدا بگریت کە لەناوەوەتەوە سەرهەڵدەدەن و ئاواتی دڵتان لەبەرچاو بگرن. هەوڵ بدەن لە رێگەی بیرکردنەوە و شیکردنەوە، توانا و بەهرەکانتان بدۆزنەوە.

کاتێك پێ دەنێیتە ناو دوورگەی نەناسراوی بوونت، شتی سەیر تێبینی دەکەیت. پاشان باوەڕ بە تواناکانت بکە. بڵێ دەتوانم، ئەو خۆشی و هەستەی کە لەکاتی

وتنی (دەتووانم) لە تۆدا دێتە کایەوە لەگەڵ هیچ شتێکدا بەراورد ناکرێت. ئەگەر تۆ بڕوابەخۆبوونێکی رەهات لە خۆتدا هێنایە کایەوە کە سەرچاوەگرتووی ئیمانێکی بەهێزە، بە راستی دەتووانیت هەموو کارێك ئەنجام بدەیت ئەگەرچی ئەوانیتر پێیان وابێت ئەستەمە. کەواتە پشت بە خۆتان ببەستن و هەموو شتێکتان لە خۆتان بوێت. ئەوە تەنیا تۆیت کە چارەنووس خۆت دەستنیشان دەکەیت. بەداخەوە زۆربەی خەڵکی هەڵە و فەرامۆشیی کارەکانی خۆیان لە ژیاندا دەخەنە گەردنی چارەنووس.

## پلیکانەی دووەم: دانانی ئامانج

هەبوونی ئامانج بۆ دەستنیشانکردنی ئاراستەی جوڵەمان لە ژیاندا گرنگە. کاتێك ئامانجێکی روون و پڕ تەحەدیمان لەپێش بێت و هیچ گومانێکمان لەبارەیەوە تیایدا پەیدا نەبێ، هەستێکی نایابمان ئەداتێ.

کەواتە لەسەر بنەمای بەهرەکان، تواناکان و خواستە راستەقینەکانی خۆتان ئامانجانە دوورمەوداکان هەڵبژێرن. وا باشترە کە ئامانجی فرەلایەن لە بواری زانستی و پەروەردە، جەستەیی و سەلامەتی، ئایینی، مەعنەوی و پیشەیی و دارایی و...هەڵبژێرن. لەم رێگەیەوە هەموو رەهەندەکانی بوونی خۆت فراوان دەکەیت. وا باشە کە ئامانجانە بە روونی بنووسیت و بخەیتە سەر پەڕەی کاغەز. کاتی گەیشتن پێیان دیاری بکەیت و هەروەها ئاگادار بیت کە دەبێ ئامانجەکان لە باوەڕتدا جێگە بکەیتەوە و ئامەزرۆییت بۆ گەیشتن پێیان دروست بکات.

با هەمیشە ئامانجەکانت لا بن و هەموو رۆژێك پێیاندا بچۆرەوە و لە خۆت بپرسە: ئەمڕۆ چ کارێك (ئەگەرچی بچوك)م بە ئاراستەی ئامانجەکانم ئەنجام داوە؟ و ناوبەناو بچۆرەوە سەریان. لەوانەیە تێبگەیت لەوەی کە ئاخۆ ئامانجەکانت زۆر

کورتبینانەیە یان زۆر زیادەڕەوانەیە و ناراستەقینەیە. لەم بارەدا دەستکارییان بکە و دۆخێکی هاوسەنگ بهێنەرە کایەوە.

## پلیکانەی سێیەم: بەرنامەڕێژی

بەرنامەکە بریتییە لە: دیاریکردنی ئامانجی ڕێژەیی و کورت مەودا کە لە ئاقاری ئامانجە دوورمەوداکاندان. ڕێگای گەیشتنیش پێیان، بەرنامەڕێژیی هەوڵێکی زیهنییە کە پێش هەوڵی جەستەیی یان ئەنجامدانێکی کارێك، مەیسەر دەبێت و ڕێگای بەدیهێنانی ئامانجە جیاکراوەکان روون دەکاتەوە. بۆ گەڵاڵەکردنی بەرنامەیەکی چالاك و کاریگەر پێویستە لە هەموو واقعیەتە پەیوەندیدارەکانی ئاگادار بیت و بە دیدێکی فرەلایەنەوە بۆ دەرفەت و سنووربەندییەکانی دەوروبەر و هێز و لاوازییە تاکەکەسییەکان (ناوەکییەکان) بەرنامەیەکی گونجاو و نەرم بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان دابڕێژرێت. پێویستە لە بەرنامەیەکی باشدا ئەو جۆرە چالاکییەی کە تۆمار بکرێت، شێوازی بەجێگەیاندن، کات و شوێن، سەرچاوەی پێویستی و هیتری بۆ بنووسرێت.

## پلیکانەی چوارەم: کار و هەوڵی ئاگایانە

هەموو مرۆڤە سەرکەوتووەکان، ئەهلی کار و هەوڵن. ئەو کەسانەی کە لە بارەی ئامانجەکانیان دەدوێن و هەرگیز دەست نادەنە هیچ کارێك، سەرکەوتوو نابن. سەرکەوتن پەیوەندی بە شانسەوە نییە. چەندەی زیاتر هەوڵ بدەین و جوڵە و چالاکی لەخۆمان بخەینەڕوو هەر بەو ئەندازەیەش لە سەرکەوتن نزیك دەبینەوە. لەبەرئەوەی تەمەن وێڕای درێژی، پانتایی و قووڵاییشی هەیە، چەندەی خێراتر و باشتر کار بکەیت زیاتر دەژیت، چونکە پانتایی ژیانتان زیاد دەکات و سەرەنجام کامەرانتر، زیندووتر و رازیتر دەبیت. بۆیە دەبێت بجوڵێیت. جوڵە دەبێتەهۆی

گەشە و باوەڕبەخۆبوون. ڕاستەوخۆ بچۆرە ناو کارەوە و هەنگاو بنێ، چونکە هەنگاونان ترس لەناو دەبات.

بڵێ: دەبێ هەر ئێستا دەست پێبکەم و دەست پێبکە، چاوەڕێ مەبە تا بارودۆخ یارمەتیدەر دەبێت، چونکە هیچ کاتێك وەها نابێ. چاوەڕێبوون بۆ دابینبوونی هەلومەرجی خوازراو، چاوەڕوانییەکە کە تا هەتایە درێژەی دەبێت.

لە هەمان کاتدا، دەبێ ئاگادار بیت کە هەوڵەکانتان بە شێوەیەکی ئاگایانە، ورد و ڕێك و پێك بێت و کارەکان بەشێوەیەکی زیرەکانە و بیرمەندانە ئەنجام بدە. هەمیشە سۆراخی باشترین ڕێگا بکە. هەمیشە ڕێگای باشتر هەن بۆ ئەنجامدانی کارەکان.

## پلیکانەی پێنجەم: ئارامگرتن و خۆگری، نەرم و نیانی

ئەلف.ئارامگرتن: کاتێك دەچیتە ناو گۆڕەپانەکە و دەست دەدەیتە کارێك، ئەوا بەشێکی گەورەی کارەکەت ئەنجام داوە، بەڵام بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکە و بەدەستهێنانی ئەنجام، دەبێ خۆگر و بەردەوام بیت. بەدواداچوونی کارەکان مێشك چالاك دەکات و ئومێدی سەرکەوتن لە مرۆڤدا بەرهەمدار دەکات.

ئەگەر لە کارەکاندا جدی نەبین، بێ بەهرەترین کەسانی مکوڕ و بەئیرادە پێشمان پێدەگرن، چونکە نەبوونی بەهرە، بە بەرەنگاری، سەخت هەوڵدان، ڕێك و پێکی و وردبوون و خۆگری قەرەبوو دەکرێتەوە. کەواتە ئیرادەیەکی پۆلایین و پایەدارتان هەبێت. هەرگیز لە هەوڵ و کۆشش ماندوو مەبن، لەوانەیە دوایین کلیل کە ماوە، والاکەری قفڵی دەرگاکە بێت.

ب.ئارامگرتن: ئارام بە، مەهێڵە کێشە و تەگەرەکانت نائومێدت بکەن. لە کێشەکانەوە فێربە و لە هەر هەڵەیەك ئەزموونێك وەربگرە.

ج.نەرم و نیانی: لە ڕێگاکانی گەیشتن بە ئامانجدا دەمارگیر مەبە و خۆت مەدەرە دەست ڕێگایەکی دیاریکراو، سۆراخی ئامانجێکی دیاریکراو بکە بەڵام لە بیروباوەڕەکانی خۆتدا وشك مەبە و نەرم بە. لە ڕێگەی دووبارە هەڵسەگاندنەوەی بەرنامەکانتان، دەست بدەنە داهێنانی نوێ و سۆراخی ڕێگەچارەی ئاسان و کرداری بکەن. کاتێك کە ئارامگرتن، نەم و نیانی و لەسەرخۆیی لە خۆت پیشان ئەدەیت، کامەرانی دەتگرێتە خۆی و تامی سەرکەوتن دەکەیت.

## پلیکانەی شەشەم:ئەنجامگیری

لەبارێکدا کە پلیکانەکانی پێشوو سەرکەوتووانە بپردرێن، ئەنجامی دڵخواز بەشێوەیەکی خۆبەخۆ دێتەدی. تەنانەت ئەگەر ئەو ئەنجامەی کە هەیە، بۆ تۆ دڵخواز نەبێت پێویست ناکات نیگەران بیت. هەموو بارودۆخێك لە بنەڕەتدا وەکو دراوێکی ئاسن دیوێکی باش و دیوێکی خراپی هەیە. دیوە باشەکە بدۆزەرەوە و ڕەهەندە پۆزەتیڤەکان بەدی بکە. شکستی ڕواڵەتی، پردێکە بەرەو سەرکەوتنی ڕاستەقینە.

## دوو پرسیار لە خۆت بکە:

١- کەموکوڕی کارەکە لە کوێدا بوو؟

٢- ڕێگا نوێکان کامانەن؟

و سەرلەنوێ ئەفرێنەرانەتر هەنگاو بنێ.

# هیوا، خۆی ژیانە

ئەڵێن ئەسپێك تووشی نەخۆشییەك بوو و لە پشت دەروازەی شارەوە بەر بووەوە. خاوەن ئەسپەکە بەرەڵای کرد و چووە ناو شارەکە. خەڵکی پێیان وت: ئەسپەکەت بەهۆی چییەوە کەوتە ناو ئەم رۆژگارە پڕ نەگبەتییەوە؟ پیاوەکە وتی: بەهۆی ئەوەی کە خەخۆری نازەنینی وەکو ئێوەی نەبوو و ناچار بوو بە بەردەوامی بارم بۆ هەڵبگرێت.

یەکێکیان وتی: بە راستی وایە، منیش وەکو ئەسپەکەی تۆم لێهاتووە. خەڵکی روانییانە جەستە لاوازەکەی و ئەو وتی: تا توانام هەبوو و بارم هەڵدەگرت ژن و مێردەکەم لەگەڵما بوون، بەڵام ئەمڕۆکە منیش وەکو ئەو ئەسپە تەنیام و چاوەڕێی چرکەساتی رۆیشتنم دەکەم.

دەڵێن: ئەو پیاوە لاوازە هەموو رۆژێك جامێك ئاوی لە لێواری جۆگا پڕ دەکرد و بۆ ئەو ئەسپەی دەبرد کە لە خۆی لاوازتر بوو و لای دادەنیشت و دەردەدڵی لەگەڵدا ئەکرد. دوای چەند رۆژێك ئەسپەکە کەوتە سەر پێیەکانی خۆی و لەگەڵ پیرەمێردەکەدا هاتە بازاڕ.

خاوەن ئەسپەکە و خەڵکەکە پێیان سەیر بوو. پێیان وت: چۆن هەڵسایەوە سەر پێ. پیرەمێردەکە پێکەنی و وتی: لەبەرئەوەی هاوڕێیەکی وەکو منی دەست کەوت کە بە تەنیا جێم نەهێشت و لە رۆژێکی سەختدا لای بووم.

دەڵێن: لەوە بەدوا پیرەمێرد و ئەسپەکە هەموو رۆژێك رێبوارەکانیان تێراو دەکرد و ئیتر چاوەڕێی مەرگیشیان نەکرد.

# هێزی بیرهاتنەوە

پیرێکی ژیر لە دەشتێکی داپۆشراو بە بەفردا هەنگاو دەنا کە گەیشتە ژنێکی چاو بە گریان.

لێی پرسی: بۆچی دەگریت؟

–لەبەرئەوەی کە بیر لە ژیانم، لە گەنجیم، لەو جوانییە دەکەمەوە کە لە ئاوێنەدا ئەمبینی و بیر لەو پیاوە دەکەمەوە کە خۆشم دەویست. خوداوەند بێ بەزەییە کە هێزی بیرهاتنەوەی داوەتە مرۆڤ، دەیزانی کە بەهاری تەمەنم دێتەوە یاد و دەگریم.

–پیاوە ژیرەکە لەناو دەشتی بە بەفرداپۆشراودا وەستا، لە خاڵێك تێڕاما و کەوتە بیرکردنەوە.

–ژنەکە چیتر نەگریا و پرسیاری کرد: لەوێدا چی ئەبینیت؟

–پیاوە ژیرەکە وتی: دەشتێك لە گوڵی سوور...خوداوەند، ئەو کاتەی کە هێزی بیرهاتنەوەی دایە من، زۆر بەخشندە بوو. چونکە دەیزانی لە زستاندا، هەمیشە دەتووانم بەهارم بێتەوەیاد و بزە بکەوێتە سەر لێوانم.

# ئەلف بێی ژیان

A

## قبوڵ بکە Accept

ئەوانیتر بەو شێوەیەی کە هەن قبوڵ بکە، تەنانەت ئەگەرچی بەلاتانەوە قورس بێت بیروباوەڕ، رەفتار و دیدوبۆچوونەکانیان دەرک بکەن.

B

## خۆتان جیا بکەنەوە Break away

خۆتان لە هەموو ئەو شتانە جیا بکەنەوە کە رێگرن لەبەردەم گەیشتن بە ئامانجەکانتان.

C

## بئەفرێنە Creat

خانەوادەیەك لە دۆستان و ئاشناکانت پێکبێنە و لەگەڵیاندا لە هیواکان، ئاواتەکان، نیگەرانییەگان و شادییەکاندا هاوبەش بە.

D

## بڕیار بدە Decide

بڕیار بدە کە لە ژیاندا سەرکەوتوو بیت. لەو بارەدا شادی رێگاکەی بەرەو تۆ ئەدۆزێتەوە و رووداوی خۆش و دڵگیر بەسەرت دێت.

E

## Explore بگەڕێ

بگەڕێ و تاقی بکەرەوە. دنیا شتی زۆری بۆ پیشاندان هەیە و تۆش دەتوانیت شتی زۆر پیشان بدەیت. هەر کاتێك کە کارێکی نوێ تاقی دەکەیتەوە، خۆت زۆرتر دەناسیت.

F

## Forgive ببەخشە

.ببەخشە و فەرامۆش بکە. کینە تەنیا بارتان قورستر دەکات و ئیلهامبەخشی نەگبەتییە. لە سەرەوەڕا بڕوانە بابەتەکە و بیرت بێت کە دەشێ هەموو کەسێك هەڵە بکات.

G

## Grow گەشە بکە

عاجات و هەستە نادروستەکانی خۆت واز لێ بێنە تاوەکو نەتوانن ڕێگر بن لەسەر ڕێگاکەت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت.

H

## Hope هیواداربە

هیوات بە باشترین شتەکان هەبێت و هەرگیز بیرت نەچێت کە هەموو شتێك مومکینە. هەڵبەت ئەگەر لە کارەکانتدا خۆگر بیت و داوای یارمەتی لە خودا بکەیت.

I

## Ignore فەرامۆش بکە

شەپۆلە نێگەتیڤەکان پشتگوێ بخە. تەرکیز بکەرە سەر ئامانجەکانت و

سەرکەوتنەکانی رابردووت بیر بێت. سەرکەوتنەکانی رابردوو نیشانە و پەیوەندین بۆ سەرکەوتنەکانی ئاییندە.

J

## سەفەر بکە Journey

سەردانی شوێنە نوێکان بکە و بە بیرکردنەوەیەکی روونەوە، ئیمکاناتی نوێ تاقی بکەرەوە. هەوڵ بدە هەموو رۆژێك شتی نوێ فێر بیت. بەم شێوەیە گەشە دەکەیت و هەست بە زیندووبوون دەکەیت.

K

## بزانە Know

بزانە کە هەموو مەسەلەیەك چەنێك قورس و دژوار بێت لە کۆتاییدا چارەسەر دەبێت. هەروەکو چۆن گەرمای دڵگیری بەهار دوای سەرمای تاقەتبەری زستان دێت.

L

## خۆشەویستی دەربڕە Love

رێگە بدە عەشق لەبری رق دڵت پڕ بکاتەوە. ئەو وەختەی کە نەفرەت لە دڵی تۆدا نیشتەجێیە، هیچ فەزایەك بۆ عەشق بوونی نییە، بەڵام کاتێك کە عەشق لە دڵتدا جێگیرە، هەموو خۆشبەختی و شادییەك لە بوونتدا هەیە.

M

## بەڕێوە ببە Manage

کات بەڕێوە ببە، تاوەکو نیگەرانییەکی کەمترت هەبێ. سوودوەرگرتنی دروست لە کات دەبێتە هۆی ئەوەی کە باشتر تەرکیز بکەیتە سەر بابەتە گرنگەکان.

N

## Notice لەبەرچاو بگرە

هەرگیز خەڵکی نائومێد و لاواز فەرامۆش مەکە و چ کۆمەکێك کە لە تواناتدا هەیە درێغی مەکە بۆیان.

O

## Open بکەرەوە

چاوەکانت بکەرەوە و بڕوانە هەموو ئەو جوانییانەی کە لە دەوروبەرت هەیە. تەنانەت لە سەختترین و خراپترین هەلومەرجەکاندا، شتی زۆر هەن بۆ سوپاگوزاری.

P

## Play یاری

بیرت نەچێت کە لە ژیانتدا سەرگەرمیت هەبێت. بزانە کە سەرکەوتن بەبێ شادی و خۆشییە رێگەپێدراوەکان، هیچ مانایەکی نییە.

Q

## Question پرسیار بکە

لەبارەی ئەو شتانەی کە نایانزانیت پرسیار بکە، چونکە تۆ بۆ فێربوون هاتوویتە سەر ئەم زەوییە.

R

## Relax بحەسێوە

رێگە مەدە نیگەرانی و دڵەنگی بەسەرتدا زاڵ بن و بیرت بێت کە لە کۆتاییدا هەموو شتێك چاك دەبێ.

S

Share **هاوبەشی بکە**

بەهرەکان، شارەزایەتییەکان، زانین و تواناییەکانت لەگەڵ ئەوانیتر بەش بکە، چونکە هەزاران قاتی ئەوەت دەست دەکەوێتەوە.

T

Try **هەوڵ بدە**

تەنانەت ئەو کاتەش کە خەونەکانت ئەستەم دیارن لە تەقەلا مەکەوە، بە هەوڵ و بەشداریکردن، لە ئەنجامدانی کارەکاندا شارەزا دەبیت.

U

Use **بەکار بێنە**

وەکو باشترین دیاری بەهرە و تواناکانت بەکاربێنە. ئەو بەهرانەی کە بەفیڕۆ دەڕۆن هیچ بەهایەکیان نییە. بەکارهێنانی دروستی بەهرە و تواناکانت پاداشتی چاوەڕواننەکراوی دەبێ.

V

Value **ڕێز بگرە**

بەها بۆ ئەو دۆست و کەسانە دابنێ کە پشتیوانیت دەکەن و هانت دەدەن و هەر کارێك کە لەدەستت دێ بۆیان بکە.

X

X-Ray **تیشکی ئێکس**

بە وردییەوە و وەکو تیشکە ئێکس بڕوانە ناو دڵەکانی کەسانی دەوروبەرت. سەرەنجام جوانی و باشی لەناو دڵیاندا بەدی دەکەیت.

Y

## لێگەڕێ Yield

لێگەڕێ با راستگۆیی و کارچاکی بێتە ناو ژیانتەوە. ئەگەر تۆ لە رێگایەکی دروستدا هەنگاو بنێیت، لە کۆتاییدا بەختەوەری ئەدۆزیتەوە.

Z

## تەرکیز بکە Zoom

کاتێك کە بیرەوەرییە تاڵەکان هۆشیان داگیر کردوویت، بڕۆرە شوێنە خۆشەکان. رێگە مەدە ناخۆشی رێگر بێت لە گەیشتنت بە ئامانجەکانت. لەبری ئەمە تەرکیز بکەرە سەر تواناکانت، خەونەکانت و سبەینێیەکی رووناك.

# چیرۆکێکی کورتی لوقمانی حەکیم

رۆژێکیان لوقمان لە کەناری رووبارێك دانیشتبوو. پیاوێك کە بەوێدا رەت دەبوو، لە لوقمانی پرسی: چەند سەعاتی تر دەگەمە گوندی دواتر؟ لوقمان وتی: بە رێگەدا برۆ. ئەو پیاوە وایزانی لوقمان گوێی لێ نەبووە. دووبارە پرسی: ئەی گوێت لێ نەبوو؟ پرسیارم کرد چەند سەعاتی تر دەگەمە گوندی دواتر؟

لوقمان وتی: بە رێگەدا برۆ. ئەو پیاوە وایزانی لوقمان شێتە و لە رۆیشتنەکەی بەردەوام بوو. کاتێك کە چەند هەنگاوێك رێگەکەی بڕیبوو، لوقمان بە دەنگێکی بەرز وتی: ئەی کابرا، یەك سەعاتی تر دەگەیتە ئەو دێیە. کابرا وتی: بۆچی پێشدا وەهات نەوت؟ لوقمان وتی: چونکە رێڕۆیشتنی تۆم نەبینیبوو، نەمدەزانی خێرا دەڕۆیت یان هێواش. ئێستا کە بینیم زانیم تۆ یەك سەعاتی تر دەگەیتە گوندەکە.

**ئەنجام:**

پێم بڵێ بە چ خێرایيەك دەڕۆیت تا پێت بڵێك کەی دەگەیت.

# قازی ڕەش و باوەڕەکانی ئێمە

تاوەکو سەدەی نۆزدە باوەڕێکی گشتی هەبوو لەمەڕ ئەوەی کە هەموو قازەکان سپین. بەڵام کاتێك ئەورووپییەکان گەیشتنە کیشوەری تازە دۆزراوە، وێڕای کەشفکردنی زۆر شتی تر، ڕووبەڕووی قازی ڕەش بوونەوە. گۆڕینی باوەڕی پێشوو زۆر سەخت نەبوو. لەوە بەدوا وترا قازەکان دوو ڕەنگن: سپی و ڕەش. هەموومان ئەو ئەزموونەمان هەیە کە گۆڕینی باوەڕەکانمان کاری ئاسان و ئەستەمیشن. هەندێ جار بە ئاسانی و بە تاکە بەڵگەیەك واز لە باوەڕێك دەهێنین، تەنانەت ئەگەرچی پێشتریش بەلامانەوە ڕاست بووبێت. بەڵام جاریش هەیە کە بە دەیان بەڵگەی پشت ئەستووریش ئامادە نین دەست لەوە هەڵبگرین کە باوەڕمان پێیەتی. گۆڕینی بیرۆکەیەك زیاتر لەوەی کە پەیوەندی هەبێ بە ڕۆڵ و پێگەی ئەو باوەڕە، پەیوەندی هەیە بە لۆژیك و جیهانبینی ئێمەوە. گۆڕینی باوەڕ دەربارەی قازی سپی کارێکی ئاسانە چونکە ئەمە تەنیا باوەڕێکی سادەیە. بەڵام ئەگەر هەر ئەو باوەڕە سادەیە بنچینەی جیهانبینیمان پێکبێنێت، مەسەلەکە زۆر جیاواز دەبێت. ئەگەر لۆژیکی تێگەیشتنی کەسێك لەسەر بنەمایەکی تۆکمە بونیادنرابێت تەنانەت ئەگەر سەدان بەڵگەش بۆ پوچەڵبوونی بخەیتەڕوو، لە ڕاستیدا کارێکی پوچ و بێ ئاکامت کردووە، چونکە لێرەدا لەبەردەم باوەڕێکی سادە دا نیت. گۆڕینی باوەڕێکی بنچینەیی پێویستی بە گۆڕینی زۆر باوەڕی تریشە.

بۆیە پێگە و رۆڵی باوەڕەکانمان لە تێگەیشتنماندا بۆ جیهان، لە هاوکێشەی ڕاستبوون و ناڕاستبوونیان گرنگترە. ئەم یەکێکە لەو چەندین بابەتەی کە دەبێتەهۆی ئەوەی کە لە گفتوگۆ لەگەڵ ئەوانیتردا نەگەینە ئەنجام. بە چاوپۆشی لەوەی کە لە بنەڕەتدا هەموو گفتوگۆیەك ئەو ئەگەرەی تیا نییە.

(کواین)ی فەیلەسوفی ئەمریکی بڕوای وایە کە لە تۆڕی تێگەیشتنی ئێمەدا بۆ جیهان، زۆرێك لە باوەڕەکان پەراوێزین و تەنیا ژمارەیەکی کەمیان لە ناوەند دان. باوەڕبوون بە قازی ڕەش لەو کۆمەڵە باوەڕە پەراوێزییانەیە کە بە ئاسانی قابیلی پێداچوونەوەیە. بەڵام باوەڕە ناوەندییەکان وێڕای بوێری و سەربەستی بیرکردنەوە لە ڕەخنەکردنیاندا، پێش هەموو شتێك پێویستیان بە ناسینەوەیە لەلایەن خۆمانەوە. سەیر لەوەدایە کە کاتێك دەست دەکەین بە لەبێژنگدانی باوەڕەکانمان تازەبەتازە ڕووبەڕووی گیانلەبەرێکی سەراپا ناکۆك دەبینەوە کە پێشتر بە تەواوەتی باوەڕی بە تێڕوانین و لۆژیکی خۆی هەبووە. ئەم گیانلەبەرە ناکۆکە من و تۆین.

# بڕینی هیوا له بڕینی دڕکەپەتك خراپتره

پیرەمێردێکی ماندوو لە بەردەم سنوقێکی خێرخوازی وەستا.

دەستی بۆ باخەڵە بچوکەکەی برد و دراوێکی ئاسنی دەرهێنا.

لە سەروەختی تێهاویشتنی دراوە لە ناو سندوقەکە، نووسینی سەر سنوقەکەی بینی: خێرکردن تەمەن زیاد دەکات. پاشگەز بووەوە و ڕۆیشت.

## ئامۆژگاری

ڕۆژێك لە ڕۆژان هارون داوای پەند و ئامۆژگاری لە (ئیبن سەماك) کرد.

ئیبن سەماك وتی:

ئەی هارون! بترسە لەوەی کە فراوانی بەهەشت ئەوەندەی ئاسمانەکان و زەوی بێت و ئەو کاتە شوێنپێیەکیش بۆ تۆ نەبێ.

# ڕێبوار سەد هونەری هەیە ئەگەر متمانەی هەبێ

ڕۆژێکیان یەکێك لە کەسە نزیکەکانی کۆچکردوو حەزرەتی ئایەتوڵڵا العوزما بهائەدینی کە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوە بۆی باسکردم کە لای ئەو بووە. سەفەر و زیارەتی حەرەمی پیرۆزی ئیمام رەزا (د.خ) هێنراوەتە بەر باس. وتم چەند باش ئەبوو کە بچووینایەتە مەشهەد!

مامۆستا فەرمووی: بچین

وتم: کەی؟

فەرمووی: ئێستا

عەبا و گۆچانەکەیم هێنا...

بەسەفەر چووین، لەپڕ بیرم هاتەوە کە هیچ پارەیەکەم پێ نییە.

لەبەر خۆمەوە وتم: نەکا جەنابیشیان پارەی پێ نەبێت. وا باشترە پێی بڵێم.

وتم مامۆستا من هیچ پارەم پێ نییە، فەرمووی منیش پێم نییە، وتم ئەی چی بکەین؟ فەرمووی با هەر بڕۆین.

بەبێ پارە کەوتینە ڕێ، لە (حوسەینییە) دابەزین تاوەکو سەرەوەی شەقامەکە بە پێ ڕۆیشتین، چاوەڕێ بووین، لەناکاو سەیرم کرد لە کۆتایی شەقامەکەوە گەنجێك بە پایسکیل بە خێرایی بە ئاراستەی ئێمە دێت.

کاتێك نزیك کەوتەوە، وەستا و کیسەیەك پارەی دایە دەست مامۆستا و وتی:

مامۆستا ئەم پارەیە هی تۆیە.

مامۆستا بێ ئەوەی کە شتێکی پێ بڵێت، روویکردە من و وتی: فلآن بیگرە و با بڕۆین.

ئەم متمانەکردنە بە خودا: ئەو هەموو کاتێك چاودێری بارودۆخ و پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی بەندەی خۆیەتی و ئەو رەزاقی هەمووانە، لە هەموو مرۆڤەکاندا نییە و بە کەمی کەسێك پەیدا دەبێ کە ئەوەندە بە خودا پشت ئەستوور بێت.

بەڵام پیاوانی خودا لە هەموو بوارەکانی ژیانی خۆیاندا، گەیشتوونەتە پایەی هاوڕێیەتی خودا و لە بوارە مادییەکان و ژیانی خۆیاندا هیچ جۆرە نیگەرانییەکیان نییە و هەمیشە خۆیان لە سایەی ئەودا دەبیننەوە و وەکو رزقبەخشێك دەیبینن و یەقینیان بەم زانینە هەیە....

# نەفسی سوك

حەوت جار نەفسی خۆم بە سوك بینی...

یەکەم جار ئەو کاتەی کە پشت بە نزمی دەبەست تا بگاتە بەرزی.

دووەم جار، ئەو کاتەی کە لەبەرانبەر شەکەتبووەکاندا هەڵدەپەڕی.

سێیەم جار ئەو کاتەی کە لەهەڵبژاردنی نێوان ئاسان و دژوار سەرپشك بوو و ئاسانی هەڵبژارد.

چوارەم جار، ئەو کاتەی کە گوناهێکی ئەنجامدا و بە بیرهاتنەوەی ئەوەی کە ئەوانیتریش وەکو ئەو دەست دەدەنە کاری گوناه، دڵنەوایی خۆی کرد.

پێنجەم جار، ئەو کاتەی کە لە رووی ناچارییەوە، شتێکی بەسەرداسەپاوی قبوڵکرد و خۆگرییەکەی بە دەرەنجامی تواناکەی زانی.

شەشەم جار، ئەو کاتەی دزێویی روخسارێکی سەرزەنشت کرد، ئەگەرچی دەمامکێکی خۆی بوو.

حەوتەم جار، ئەو کاتەی کە دەستیکرد بە پیاهەڵدان و بە فەزیلەتێك لەقەڵەمیدا.

(جوبران خەلیل جوبران)

# پیاوی کۆستکەوتوو و ماری کلکبڕاو

پیاوێکی هەژار لەگەڵ ژن و کوڕەکەیدا ژیانێکی سەختی بەسەر دەبرد. پیاوەکە خەریکی کۆکردنەوەی دڕك بوو. هەر لەو ڕۆژانەدا کە هیچ خۆراکێکیان نەبوو، ژنەکە جامێك شیری بۆ مێردەکەی ئامادە کرد. پیاوەکە لە بیابان پاش کارەکەی، هات شیرەکە بخواتەوە، مارێکی بینی کە شیرەکەی دەخواردەوە. دڵی پێی سوتا و تەماشای کرد. مارەکە پاش خواردنەوەی شیرەکە گەڕایەوە ناو کولانەکەی و سکەیەکی ئاڵتونی بە دەمیەوە گرت و خستیە ناو جامی بەتاڵی شیرەکە. پیاوەکە سوپاسی خودای کرد. سبەی پیاوەکە دیسان شیری هێنایەوە و دیسان بەسەرهاتەکە دووبارە بووەوە. بەمشێوەیە پیاوەکە هەموو ڕۆژێك جامێك شیری بۆ مارەکە دەهێنا و سکەیەکی وەردەگرت تا ئەوەی کە خێزانەکە دەوڵەمەند بوون. پیاوەکە کە کەسێکی بەتەقوا بوو، بەرەو حەج کەوتە ڕێ و کوڕەکەی ڕاسپارد تا هەموو ڕۆژێك جامێك شیر بۆ مارەکە ببات. کوڕەکە چەند ڕۆژێك ئەمەی کرد و مارەکەش هەموو جارێك سکەیەکی ئاڵتونی ئەخستە ناو جامەکەوە. ئەوەبوو ڕۆژێکیان کوڕەکە لەبەرخۆیەوە بیری لەوە کردەوە کە ئەمە چ کارێکە؟ ئەمجارەیان مارەکە بکوژێت و هەموو سکەکان لە کولانەکە بهێنێتە دەرەوە. سبەی ئەو ڕۆژە کاتێك کە مارەکە دەیویست بچێتەوە ناو کولانەکەی، کوڕەکە بە بەردێك هێرشی کردە سەر مارەکە، بەردەکە کلکی مارەکەی لێکردەوە و مارەکەش بۆ بەرگریکردن

لە خۆی بە کورەکەیەوە دا. پیاوەکە لە مەکە گەڕایەوە، لە ڕووداوەکە تێگەیشت. جامێکی پڕ شیری دەست دایە و چووە شوێنەکە. مارەکە هات و شیرەکەی خواردەوە و سکەیەکی خستە ناو جامەکەوە. پیاوەکە داوای لێبووردنی لێکرد. مارەکەش لە وەڵامدا وتی:

تا کلکی من بیری کوڕەکەت نخاتەوە

هاوڕێیەتی من و تۆ وەکو خۆی لێ نایەتەوە

## سەرنج

بەردەوامی دۆستایەتی بە بیرهاتنەوەی ناخۆشییەکان ئەستەمە.

# بەهای دەسەڵات

ڕۆژێکیان باڵوڵ چووە لای هارون ئەلرەشید.

جێنشین وتی: ئامۆژگارییەکەم بدەیە!

باڵوڵ لێی پرسی: ئەگەر لە بیابانێکی بێ ئاودا، تینوویێتی بێهێزت بکات بە جۆرێك کە خەریك بێ بمریت، لەبەرانبەر قومە ئاوێکدا کە تینوێتیت بشکێنێت چەنێك پارە ئەدەیت؟

وتی:.......سەد دیناری ئاڵتون.

پرسی: ئەی ئەگەر خاوەنی ئاوەکە بەو پارەیە رازی نەبێت؟

وتی: نیوەی دەسەڵاتەکەم

باڵوڵ وتی: ئەی ئەگەر تووشی نەخۆشی پەنگخواردنەوەی میز ببیت و چارەی نەبێ، چی ئەبەخشیت بۆئەوەی چارەسەر بکرێیت؟

وتی: نیوەکەی تری دەسەڵاتم.

باڵوڵ وتی: دە کەوایە ئەی جێنشین، ئەم دەسەڵاتەی تۆ کە وابەستەیە بە ئاو و میز، نەکەی لوتبەرز بیت کە بە خراپی لەگەڵ خەڵقی خوادا رەفتار بکەیت...

# کاروبارەکان بە خودا بسپێرە

پیاوێك دەوڵەمەند هەبوو کە هەمیشە نیگەران و دڵتەنگ بوو. هەموو سامانەکانی دنیای هەبوو بەڵام هیچ کاتێك دڵی خۆش نەدەبوو. ئەو خزمەتکارێکی هەبوو کە ئیمانی بە خودا بەهێز بوو. ڕۆژێکیان خزمەتکارەکە سەیریکرد پیاوەکە تا ڕادەی مردن دڵتەنگە بۆیە پێی وت: (گەورەم، ئایا ئەوە ڕاست نییە کە پێش هاتنەدنیای تۆ خودا جیهانی بەڕێوەبردووە؟)

پیاوەکە وتی: بەڵێ...

خزمەتکارەکە لێی پرسی: ئایا ڕاستە کە خودا پاش ئەوەی تۆ دنیا جێ دەهێڵیت بەڕێوەی دەبات؟

متمانەی پێ بکە، کاتێك ڕاڕاییە تاریکەکان هێرشت بۆ دێنن!

پشتی پێ ببەستە، کاتێك کە هێز و وزەت کەمە!

متمانەی پێ بکە، چونکە کاتێك کە بە سادەیی متمانەی پێ بکەیت، متمانەکەت دەبێتە سەختترین شت.

ئایا ڕێگا، سەخت و ناهەموارە؟

بە خودای بسپێرە!

ئایا ئەچێنیت و هەڵناگریتەوە؟

بە خودای بسپێرە.

ئیرادەی مرۆیی خۆت بەو بسپێرە.

بە خاکەڕاییەوە گوێ بگرە و بێدەنگ بە.

ئاگایی و هۆشت لێوانلێو دەبێ لە عەشقی ئیلاهی.

بە خودای بسپێرە!

لەم دنیا تێپەڕەدا، ئەو دنیایەی کە شتەکان دێن و دەڕۆن، هیچ شتێك نامێنێتەوە. کەوایە شتێك هەیە بەهای نیگەرانبوونی هەبێت.

## هۆنراوەی جوانی ژیان

تێپەڕی ئەم تەمەنە، تۆ ئەزانیت چۆن؟
پوچ و زۆر خێرا...وەکو ئەو بایەی کە دەهات
هەمووی خەتای منە...خۆم دەزانم...
کە بیرم نەکردەوە.
و ڕۆژێك لە ڕۆژان تێڕانەمام.
سەعاتێك
یان ساتێك
کە چۆن ڕەت دەبێ عومری گران
منالّکارێك سەرقاڵ بوو بە یارییەوە...بە کاتی بەتاڵ بە چالاکی
دوور لە چاکە و خراپە و مەرگ و ژیان.
هەمووان وتیان ئێستا تا منالّە، لێگەڕێن پێبکەنێت بە شادی
کە ئیتر دوای ئەوە دەرفەتی پێکەنینی نییە!!
ئەبێ بنالّێنیت
من هیچم نەپرسی...
کە بۆچی نابێ دواتر پێبکەنیت؟
من هیچم نەپرسی...
کە دوای ئەمە بۆچی...
ئەبێ بنالّێنیت
کەسیش نەیگوت.
ژیان چییە؟
بۆچی دێین؟
دوای ئەم چەند بەرەبەیانە ئەبێ ڕوو بکەینە کوێ؟

بە کام بنە و بارگەوە بچینە سەفەر؟

من نەمپرسی و کەسیش هیچی پێ نەوتم؟؟

منداڵکارێك سەرقاڵ بوو بە یارییەوە...بە کاتی بەتاڵ بە چالاکی

دوور لە چاکە و خراپە و مەرگ و ژیان.

دوای ئەوە دیسان تێنەگەیشتم...

کە چۆن تەمەن تێپەڕی؟

بەڵام هەموویان وتیان هێشتا گەنجە.

لێگەڕێ گەنجێتی بکات. کەڵك لە تەمەن وەرگرێت. کامەران بێ.

لێگەڕێ دڵخۆش و بێ خەم بێ.

دوای ئەوەش دیسان تەمەنێکی هەیە.

کەسێك هاواری کرد کە ئەبێ ئەو، لێرە بەدوا بیر لە سبەی بکاتەوە.

ئەویتر هەڵیدایە و وتی کە سبەی هات بیری لێ بکاتەوە.

سێیەمیان وتی: بەو شێوەیەی کە دوێنێی چوو...

ئەمڕۆشی دەڕوات، هەروەها سبەینێکەشی...

لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، من نەمپرسی چۆن تێپەڕی...

ئەو هەموو توانا و وزە زۆرە بە چی بەهەدەر چوو؟

نە بیرکردنەوە و نە تێڕامان هەبوو، ماوەیەك

تەمەن تێپەڕی بەبێ ئاکام و بە گاڵتەجاڕی....

چ توانایەکی زۆرم بە بەلاش لەدەست دا...

من تێنەگەیشتم و کەسیش هیچی نەوت

هێزی سەردەمی گەنجی

دەیتووانی تاوەکو لای خودا بمبات

بەڵام بێهودە بە با چوو لاوی، هەیهات

ئەو کەسانەی کە نەیاندەزانی (ژیان یەعنی چی؟) ڕێنوێنم بوون

تەمەنیان بێ ئاگا و بێهودە دەڕۆیشت

به منیشیان دەوت وەکو ئەوان بم
وەکو ئەوان بەردەوام بیرم لای خواردن بێ
بیرم لای بژێوی، لای گەڕان بێت.
کەس هیچی پێم نەوت. ژیانیش
ئەوە نییە کە لەبیری خۆت و غافڵ بیت لە جیهان
من تێنەگەیشتم و کەسیش هیچی نەوت
ئێستا دەزانم ئامانج لە ژیان ئەمەیە هاوڕێ:
من بۆ ئەوە دروست بووم کە بە ئیرادەیەکی بتەو
پێم لە کۆتی دڵخوازییەکان بێنمەدەر
پێم بنێمە ناو ڕێگای حەقیقەت
بە دڵێکی ئاسودەوە،
لە دەرەوەی شەهوەت و ئارەزوو و ئیرەیی و کینە و بەخیلی
پڕ لە عەشق و سەربەرزی و تەقوا...
لە ڕێگای دۆزینەوەی راستییەکاندا کۆشش بکەم
گیراوەی بوێری و هیوا و ئازایەتی بنۆشم
زرێی جەنگ بۆ خراپە و ناحەقی بپۆشم
ڕێگای حەق بگرمە بەر و تەنیا حەق بڵێم
ببمە چرای ڕێگەی ئەوانیتر و بە مەشخەڵی خۆم
ڕێگا پیشانی هەمووان بدەم گەرچی سەرا بسوتێم خۆم
من بۆ ئەوە دروست بووم کە بەرهەمهێن بم
نەك زیادە و بێ جۆش و خرۆش
عومر بەباچوو و بە حەسرەت خامۆش بووەوە
ئەی سەد مەخابن کە تەمەن تێپەڕی،
لە ماناکەی تێگەیشتم...

# مەرجی دانایی

ڕۆژێکیان کوڕێکی گەنج لە شارێکەوە هاتە لای مامۆستا و پێی وت: دەمەوێ لە کەمترین ماوەدا وانەکانی مەعریفەت فێر بم و بگەڕێمەوە شارەکەی خۆم.

مامۆستا بزەیەکی هات و وتی: (بۆچی ئەوەندە پەلەتە؟)

کوڕەکە وتی: (دەمەوێ وەکو تۆ ببمە پیاوێکی دانا و مرۆڤەکانی شار لە دەوری خۆم کۆ بکەمەوە و بە وتنەوەی وانەی مەعریفەت شانازییان بەسەردا بکەم!)

مامۆستا بزەیەکی هات و وتی: (تۆ هێشتا ئامادەیی ئەوەت تیا نییە وانەکان وەربگریت! بگەڕێوە و لەئێستادا سۆراخی مەعریفەت مەکە!)

کوڕەکە بە هەستێکی بریندارەوە گەڕایەوە شار.

ساڵانێك تێپەڕی و کوڕە گەنجەکە بووە پیاوێکی پێگەیشتوو و بەئەزموون.

دوای دە ساڵ هاتەوە لای مامۆستا و بێ ئەوەی هیچ بڵێت لە بەرانبەر مامۆستادا وەستا! مامۆستاش دەستبەجێ ناسییەوە و لێی پرسی: هێشتا دەتەوێ مەعریفەت فێری ئەوانیتر بکەیت؟

پیاوەکە سەری شۆڕ کرد و بە شەرمەوە وتی: چیتر بۆچوونی ئەوانیتر بەلامەوە گرنگ نییە. دەمەوێ تەنیا بۆ خودی خۆم مەعریفەت فێر بم و فێری ئەوە بم کە ژیانی خۆم چاك بکەم. لێگەڕێ ئەوانیتر بە کار و کرداری من ئیمان بە کاریگەریی ئەم مەعریفەتە بهێنن. مامۆستا بزەیەکی هات و وتی: تۆ ئێستا ئامادەی وەرگرتنی وانەکانی مەعریفەتیت. تۆ دەبیتە مامۆستایەکی گەورە! چونکە سەرەتا دەتەوێ مەعریفەت لە هەموو ژیانی خۆتدا ئەزموون بکەیت و لە خۆتدا بەرجەستەی بکەیت و لەهەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە بۆچوونی ئەوانیتر لەم میانەدا بۆت گرنگ نییە.

# کوڕێکی بچکۆلە و پیرەمێردێك

کوڕە بچکۆلەکە وتی: (هەندێ جار کەوچك لە دەستم ئەکەوێتە خوار).

پیرەمێردی بەستەزمان وتی: (لە دەستی منیش ئەکەوێ خوار).

کوڕە بچکۆلەکە لەسەرخۆ وتی: (من هەندێ جار خۆم تەڕ ئەکەم).

پیرەمێرد پێکەنی و وتی: (منیش هەروا).

کوڕە بچکۆلەکە وتی: (من زۆر جار دەگریم).

پیرەمێرد سەری لەقاند و وتی: (منیش هەروا).

کوڕە بچکۆلەکە وتی: (لە هەمووی خراپتر ئەوەیە کە گەورەکان گرنگیم پێ نادەن).

پیرەمێرد هەستی بە گەرمیی دەست گنجاوییەکانی کرد و وتی: (تێدەگەم دەڵێیت چی بچکۆل، تێدەگەم).

# تەنیا و تاوانبار

(ڤینگ)شای ژێر بڕیاریدا زیندانی کۆشکەکەی بەسەر بکاتەوە و گوێبیستی سکالاکانی زیندانییان بێت.

زیندانییەکی تۆمەتبار بە کوشتن وتی: (من بێ گوناهم. تەنیا لەبەرئەوە منیان هێنایە ئێرە چونکە نیازم وابوو ژنەکەم بکوژم. بەلام کەسم نەمکوشت.

ئەویتر وتی: (منیان بە بەرتیلدان تۆمەتبار کردووە. بەلام من تەنیا ئەو دیارییەم قبوڵکرد کە پێیان بەخشیم.

هەموو زیندانییەکان لەبەرانبەر (ڤینگ)شا بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە بێگوناهن. بەلام یەکێکیان کە گەنجێکی تەقریبەن بیست ساڵان بوو وتی:

من تاوانکارم. لە شەڕێکدا براکەمم بریندار کرد و شایەنی سزام. لێرە دەتووانم بیر لە دەرەنجامی کارە دزێوەکەم بکەمەوە.

(ڤینگ شا) هاواریکرد: دەستبەجێ ئەم زیندانییە ئازاد بکەن! ئەو هەموو مرۆڤە بێگوناهە لێرەن! ئەم کابرایە هەموویان خەراپ دەکات!

## گرنگی پێدان!!

دوو برا کە لە خێزانێکدا گەورە بوون، توانا و تایبەتمەندییەکانیان جیاوازە. برا گەورەکە توانای ڕێنوێنی و ڕێبەرایەتیکردنی هەیە. نەك تەنیا لە خوێندندا ئەنجامی باشتری هەبووە، بەڵکو لە وەرزشیشدا شوێنپەنجەی دیار بووە. برای دووەم بە ساڵێك لە برای یەکەمیان بچوکترە. ئەوان لە قوتابخانەیەکدا خوێندوویانە. هەربۆیە برا بچوکەکە لە کاتی خوێندندا ڕووبەڕووی فشاری زۆر بووەتەوە. مامۆستاکانی هەمیشە سەرزەنشتیان دەکرد لەبەرانبەر ئەوەی کە براکەی باشترە و تەنانەت سەرنجڕاکێشتر و بەرچاوترە. برا بچوکەکە نەك تەنیا لە قوتابخانە، بەڵکو لە ماڵەوەش ڕووبەڕووی فشار دەبووەوە. کاتێك کە هەڵەیەکی بچوکی ئەنجام دەدا، دایکی دەیگوت: لە برا گەورەکەتەوە فێر بە. ئەو قەت نیگەرانم ناکات. کاتێك لە تاقیکردنەوەکاندا نمرەی مام ناوەندی دەهێنا، باوکی دەیگوت: ئەی هاوار، برا گەورەکەت ئەوەندەش خۆی ماندوو نەکرد، کەچی نمرەی بەرزی هێنا. بۆچی سەعیکردن ئەوەندە قورسە بەلاتەوە؟

لە ڕاستیدا برا بچوکەکەش هەوڵی ئەدا، بەڵام چەندەی هەوڵی ئەدا ئەنجامی هەوڵ و کۆششەکانی نەدەگەیشتە نیوەی برا گەورەکەی. برا گەورەکە وەکو چرایەکی دەریا دەدرەوشایەوە و ئەو لە لایەوە وەکو مۆمێك وابوو. برا گەورەکە لە زانکۆیەکی بەناوبانگ وەرگیرا، بەڵام نمرەکانی برا بچوکەکە نزم بوون و نەیتوانی

بچێتە زانکۆ. ئەو بە گوێرەی ئارەزووی خۆی کۆلێژێکی تایبەتی هونەرە جوانەکانی هەڵبژارد و درێژەی بە خوێندندا.

برا گەورەکە دوای بەدەستهێنانی بڕوانامەی پسپۆڕی پێشکەوتوو، لە کۆمپانیایەکی ئەلکترۆنی دەستبەکار بوو و پەیتا پەیتا دەبووە ستوونی ئەو کۆمپانیایە و مایەی شانازی دایك و باوکی بوو.

برا بچوکەکە دوای تەواوکردنی خوێندن لە چەند کۆمپانیایەکی بچوك بەشێوەی کاتی کاری کرد و بووە یاریدەدەری وێنەگر. دایك و باوکی پێیان وابوو ئەگەر ئەو بتوانێت ئەوەندە داهاتی هەبێت کە ژیانی خۆی و خێزانەکەی دابین بکات، ئەوا بەسە. بۆیە برا بچوکەکە، بووە هەواڵنێری کۆمپانیایەکی تەلەڤزیۆن و هەموو رۆژێك سۆراخی هەواڵەکانی دەکرد و پەیوەندی لەگەڵ برا گەورەکەیدا کەم بووەوە.

رۆژێك لە رۆژان برا گەورەکە کە بەشێوەیەکی ئاسایی لە کۆمپانیاکەدا زۆر سەرقاڵ بوو، گەڕایەوە ماڵەوە و بە براکەی وت: تکات لێدەکەم ئاگات لە دایك و باوکم بێت. من دەستم لە کارەکەم کێشاوەتەوە و بۆ خوێندنی هونەرە هاوچەرخەکان دەچمە پاریس.

ئەو وتی: پێش ماوەیەك بەهۆی ماندوێتییەوە لەهۆش خۆی چووە و لە کۆمپانیاوە گواستوویانەتەوە بۆ نەخۆشخانە. ژیانی رووبەڕووی مەترسییەکی جدی ببووەوە. لەم رووداوەوە گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە ژیانی مرۆڤ سنووردارە. برا بچوکەکە بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە لێی پرسی: ئەی تۆ بەو هەموو سەرکەوتنانەی کە بەدەستت هێناوە تاوەکو ئێستا بۆ خودی خۆت نەژیاویت؟ برا گەورە وتی: نەخێر، من هەمیشە بۆ ئاوات و خواستەکانی ئەوانیتر ژیاوم. هیچ کاتێك نەمتوانیووە بەپێی ئارەزووەکانی خۆم بژیم. من هەمیشە ئیرەییم بە تۆ دەبرد. تۆ ئیشی دڵخوازی خۆت هەڵبژارد و بەردەوام لە ژیانی خۆتدا

دڵخۆش و سەربەستیت. برا بچوکەکە بە بیستنی قسەکانی براکەی هەم هەستی بە لوتبەرزی کرد و هەم دڵی بە براکەی سوتا. هەستی لوتبەرزییەکەی لەبەرئەوە بوو کە براکەی وێڕای ئەوەی لە رواڵەتدا سەرمەشقی ئەوانیتر بوو ئیرەیی بەم دەبرد، هەستی بەزەییەکەشی لەبەرئەوە بوو کە ئەگەر برا گەورەکەی نەبووایە و باوك و دایکی ئەو هەمووە گرنگییەیان پیێ نەدایە، ئەو نەیدەتووانی بە ئارەزووی خۆی و بە ئارامی بژیت. ئەو لەبەر خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە کە هەندێ جار لانەکردنەوەی دایك و باوك دەتووانێ هۆکاری خۆشبەختی و ئاسودەیی بێت.

# دنیای بێ کردار

لە کافێی فرۆکەخانەکەدا کەسێکی لێ بوو کە جگەرە لەدوای جگەرەی دەکێشا. کەسێك هات و لەبەردەمیەوە دانیشت و پێی وت: ببوورە بەڕێز! تۆ رۆژی چەند جگەرە دەکێشیت؟

–مەبەستت؟

–مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر پارەی ئەم جگەرەیەت کۆ بکردایەتەوە، سەرباری ئەو پارەیەی کە بەهۆی ئەم بێ دینەوە، لە دەرمان و دکتۆری ئەدەیت، ئێستا ئەو فرۆکەیەی کە لەوێیە هی تۆ بوو!

–تۆ جگەرە ئەکێشیت؟

–نەخێر!

....فرۆکەت هەیە؟

–نەخێر!

–بەهەرحاڵ سوپاس بۆ ئامۆژگارییەکەت، بۆ زانیاریت ئەو فرۆکەیەی کە پیشانیشتدام هی منە.

# بەرائەتی لەدەستچوو
# بە تێپەڕینی کات

دەروێشێك منالێکی هەبوو کە بەهۆی خۆشویستنی زۆریەوە، شەوانە لەتەك خۆی ئەیخەواند. شەوێکیان بینی کە منالەکە لەناو پێخەفەکەیدا نالەنالیەتی.

وتی: گیانی باوکە بۆچی خەوت پیا ناکەوێت؟

وتی: باوکە! سبەی پێنج شەممەیە و دەبێ وانەکانی هەفتەیەك لای مامۆستا بخەمەڕوو و لەترسی ئەمە خەوم لێناکەوێت. ئەو دەروێشە کە نیگەران بوو، بە بیستنی ئەو قسەیە هاواریکرد و لەهۆش چوو. هەر کە بەهۆش هاتەوە وتی: وەی هاوار، منالێك کە دەبێ وانەکانی هەفتەیەك لەبەردەم مامۆستا بلێتەوە شەو خەوی پیا ناکەوێت. ئەی من کە دەبێ لە ڕۆژی قیامەتدا کار و کردەوەی حەفتا سالّ لە بەردەم عەرشی خودا بخەمەڕوو، حالّم چۆن بێت.

# چیرۆکێك لەبارەی ئەدیسۆنەوە

ئەدیسۆن لە سالآنی پیریدا دوای کەشفکردنی گلۆپ، بە یەکێك لە دەولەمەندانی ئەمریکا هەژمار دەکرا و هەموو داهاتە زۆرەکەی لە تاقیگەکەیدا خەرج دەکرد کە بینایەیەکی گەورە بوو. ئەم تاقیگەیە، گەورەترین عەشقی ئەو پیرەمێردە بوو. هەموو رۆژێك داهێنانێکی نوێی تیادا دەهاتە کایەوە و دوای ئامادەکردن دەخرایە بازارەوە. هەر لەو رۆژانەدا بوو کە لە نیوەشەودا لە فەرمانگەی ئاگرکوژاندنەوەوە هەوالّیان دایە کورەکەی ئەدیسۆن کە تاقیگەکەی باوکی ئاگری تێبەربووە و لە راستیدا کەس هیچی لەدەست نایەت و هەموو هەولّی کارمەندانی ئاگرکوژێنەوە ئەوەیە کە ئاگر نەگاتە بینایەکانی تر! ئەوان داوایانکرد کە بابەتەکە بەشێوەیەکی قبولّکراو بگەیەنرێتە پیرەمێردەکە (ئەدیسۆن).

کورەکە بیری لەوە کردەوە کە لەوانەیە پیرەمێرد بە بیستنی هەوالّەکە تووشی جەلّتە ببێت و بۆیە لە گەیاندنی هەوالّەکە پاشگەز بووەوە و خۆی گەیاندە شوێنی رووداوەکە و بەویەری سەرسورمانەوە سەیریکرد پیرەمێرد لەبەرانبەر بینایەی تاقیگەکەیدا لەسەر کورسییەك دانیشتووە تەماشای سوتانی بەرهەمی هەموو تەمەنی دەکات!! کورەکە بریاریدا نەچێتە پێشەوە و ئازاری باوکی نەدات. ئەو پێی وابوو باوکی لە خراپترین هەلومەرجی ژیانیدایە. لەناکاو باوکەکە (ئەدیسۆن) ئاوری دایەوە و کورەکەی بینی و بە دەنگێکی بەرز و پر لە شادییەوە وتی: (کورم ئەوە تۆ لێرەیت؟ ئەبینیت چەنێك جوانە؟! رەنگالّەی بلّێسەکان ئەبینیت؟

سەرسورهێنە!! من پێم وایە ئەو بڵێسە وەنەوشەییانە بەهۆی سوتانی گۆگرد لەگەڵ فۆسفۆر هاتووەتەکایەوە! ئای! خوایە گیان، زۆر جوانە! خۆزگە دایکیشت لێرە ئەبوو و ئەم دیمەنەی ئەبینی.

کەم کەس هەیە کە لە ماوەی تەمەنیدا دەرفەتی بینینی دیمەنێکی وەها جوانی هەبێت! تۆ ئەڵێی چی کوڕەکەم؟!) کوڕەکە بە سەرگەردانی و سەرسوڕمانەوە وەڵامی دایەوە: (باوکە، تۆ هەموو ژیانت لەناو ئاگردا دەسوتێت کەچی باسی جوانیی رەنگی بڵێسەکان دەکەیت؟!! چۆن ئەتووانیت؟ من سەراپای جەستەم ئەلەرزێت و تۆش بە خوێنساردییەوە دانیشتوویت؟!) باوکەش وتی: (کوڕم من و تۆ هیچمان لەدەست نایەت. کارمەندانی ئاگرکوژێنەوەش هەرچی پێیان کرا کردیان. لەم ساتەدا باشترین شت کە بیکەیت ئەوەیە کە خۆشی لەم دیمەنە ببینیت کە دووپات نابێتەوە!...ئێمە بیر لە تاقیگە و بونیادنانەوە و نوێکردنەوەی ئەو سبەینێیە دەکەینەوە! ئێستا کاتی ئەوە نییە! بڕوانە بڵێسە جوانەکان کە چیتر دەرفەتت نابێ!)

تۆماس ئەدیسۆن ساڵی دواتر دیسا لە تاقیگە نوێکەیدا سەرقاڵی کارکردن بوو و هەر ئەو ساڵە گەورەترین داهێنانی مرۆیی ، واتە تۆمارکەری دەنگی پێشکەشی جیهان کرد. بەڵێ، ئەو ڕێك ساڵێك دوای ئەو رووداوە گرامافۆنی دروستکرد.

لەوانەیە بەرهەمی چەندان ساڵی کاری سەختت لە شەوێکدا لەناو بچێت، بەڵام شتێکی وەها نابێ لە بەردەوامی هەوڵەکانت پاشگەزت بکاتەوە.

سەرسەخت و بێ وچان بە.

# بەنرخترین شت

ڕۆژێکیان فریشتەیەك سەرپێچی فەرمانی خودای کرد و بۆ وەڵامدانەوەی کردارە هەڵەکەی، لەبەردەم تەختی دادگاییدا ئامادە بوو. فریشتە داوای لێبووردنی کرد. خواوەندیش نیگایەکی میهرەبانانەی فریشتەکەی کرد و فەرمووی: من تۆ سزا نادەم، بەڵام دەبێ کەفارەتی گوناهەکەت بدەیت. کارێکت پێ دەسپێرم، بچۆرە سەر زەوی و بەنرخترین شتی دنیام بۆ بێنە. فریشتەکە کە خۆشحاڵ بوو بەوەی دەرفەتێکی بۆ لێخۆشبوون هەیە بە خێرایی چووە سەر زەوی. ساڵانێك لەسەر زەوی بەدوای بەنرخترین شتی دنیادا گەڕا و ...

ڕۆژێکیان گەیشتە گۆڕەپانی جەنگ، سەربازێکی گەنجی دۆزییەوە کە بە سەختی بریندار ببوو. کابرای گەنج لەپێناو بەرگریکردن لە وڵاتەکەیدا جەنگابوو و ئێستا لەگیانەڵادا بوو. فریشتەکە دوایین دڵۆپە خوێنی سەربازەکەی هەڵگرت و بەخێرایی گەڕایەوە بەهەشت.

خوداوەند وتی: (بە ڕاستی ئەو شتەی کە هێناوتە بەنرخە. سەربازێك کە بۆ نیشتمانەکەی گیانی خۆت بەخت دەکات، بەلای منەوە زۆر ئازیزە. بەڵام بگەڕێوە و زیاتر بگەڕێ.

فریشتەکە گەڕایەوە سەر زەوی و لە سۆراخکردنەکە بەردەوام بوو. ساڵانێکی زۆر لە شارەکان، دارستانەکان و دەشتەکاندا گەڕا. سەرەنجام ڕۆژێك لە نەخۆشخانەی گەورە، پەرستارێکی بینی کە لە گیانەڵادا بوو.

پەرستارەکە چاودێری کەسانێکی کردبوو کە ئەم نەخۆشییەیان هەبوو و ئەوەندە سەرسەختانە کاری کردبوو کە بەرگری لەدەستدابوو. پەرستار بە رەنگ زەردی لە پێخەفی مەرگی خۆیدا راکشا بوو و دوایین هەناسەکانی ئاڵوگۆڕ دەکرد.

لەکاتێکدا کە پەرستارەکە لە گیانەڵادا بوو، فریشتەکە دوایین هەناسەی پەرستارەکەی هەڵگرت و بەخێرایی بەرەو بەهەشت گەڕایەوە.

بە خودای وت: (خودایە! دڵنیام هەناسەی ئەم پەرستارە فیداکارە بەنرخترین شتی دنیایە). خوداوەند لە وەڵامدا وتی:ئەم هەناسەیە شتێکی بەنرخە. کەسێك کە گیانی خۆی بۆ ئەوانیتر بەخت دەکات، بێگومان لای من بەنرخە. بەڵام بگەڕێوە و دووبارە بگەڕێ. دیسان گەڕایەوە سەر زەوی و ساڵانێکی زۆر گەڕا. شەوێکیان پیاوێکی شرور * کە سواری ئەسپ ببوو لە دارستان دۆزییەوە. پیاوەکە شمشێر و نێزەی پێ بوو. ئەو دەیویست تۆڵە لە پاسەوانی دارستان بکاتەوە. پیاوەکە گەیشتە کۆڵێتێکی بچوك کە پاسەوان و خێزانەکەی تیادا دەژیان. رووناکی لە پەنجەرەکەوە دەهاتە دەرەوە. پیاوە شرورەکە لە ئەسپەکە دابەزی و لە پەنجەرەکەوە بە وردی روانییە ناو کۆڵێتەکە. ژنی پاسەوانەکەی بینی کە کوڕەکەی دەخەوێنێت و گوێی لە دەنگی بوو کە نزای شەوی فێری مناڵەکەی دەکرد. شتێك لەناو دڵی رەقی پیاوەکەدا تووایەوە. ئایا سەردەمی منالیی خۆی هاتبووەوە یاد؟ چاوەکانی کابرا پڕبوون لە فرمێسك و هەر لەوێ لە رەفتارە درێوەکەی پەشیمان بووەوە و تۆبەی کرد. فریشتەکە دڵۆپەیەکی فرمێسکی کابرای هەڵگرت و بەرەو بەهەشت فڕی.

خوداوەند وتی:

ئەم دڵۆپەیە بەنرخترین شتی دنیایە، چونکە ئەم فرمێسکە مرۆییەیە کە تۆبەی کردووە و تۆبەش دەرگاکانی بەهەشت دەکاتەوە!!

# جوانترین دڵ

ڕۆژێکیان پیاوێکی گەنج لەناو شارێك وەستابوو و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لە هەموو ناوچەکەدا جوانترین دڵی هەیە.

خەڵکێکی زۆر کۆ بوونەوە، دڵی بە تەواوی ساغ بوو و هیچ برینێکی پێ نەکەوتبوو و هەمووان لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە دڵی ئەو بە ڕاستی جوانترین دڵی دنیایە.

پیاوە گەنجەکە بە شانازییەوە و بە دەنگێکی بەرز بەردەوام بوو لە پیاهەڵدانی دڵی خۆی. لەناکاو پیرەمێردێك هاتە بەردەم قەرەباڵغییەکە و وتی جوانیی دڵی تۆ ناگاتە جوانیی دڵی من. پیاوە گەنجەکە و ئەوانیتر بە سەرسوڕمانەوە ڕوانییانە دڵی پیرەمێردەکە. دڵی ئەو بە هێزێکی تەواوەوە لێی ئەدا بەڵام پڕ لە برین بوو. چەند بەشێکی لێ هەڵگیرابوو و چەند پارچەیەکی لە شوێن دانرابووەوە و بەباشی شوێنەکەیان پڕ نەکردبووەوە. خەڵکی کە دڵی کابرایان بینی سەریان سوڕما و لەبەر خۆیانەوە دەیانوت چۆن بانگەشەی ئەوەی دەکات کە جوانترین دڵی هەیە؟ پیاوە گەنجەکە ئاماژەی بە پیرەمێردەکە کرد و وتی: (بە دڵنیاییەوە تۆ گاڵتە ئەکەیت، دڵی خۆت بە دڵی من بەراورد بکە، دڵی تۆ تەنیا مشتێکە لە برین و زام).

پیرەمێر وتی: (ڕاستە. دڵی تۆ سەلامەت دیارە، بەڵام من هەرگیز دڵی خۆم بە دڵی تۆ ناگۆڕمەوە. هەر برینێك پیشاندەری مرۆڤێکە کە من عەشقم پێی بەخشیووە

و من بەشێکم لە دڵی خۆم جودا کردووەتەوە و پێم بەخشیووە. هەندێ جار ئەویش بەشێکی دڵی خۆی بە من داوە کە لە شوێنی پارچە بەخشیووەکەم دامناوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو دوو پارچەیە وەکو یەك نەبوون، زامی جێماوە لە دڵمدا هەن کە بەلامەوە خۆشەویستن، چونکە بیرهێنەرەوەی عەشقی نێوان دوو مرۆڤن. هەندێ جار پارچەی دڵم بەخشیووەتە مرۆڤەکان بەڵام ئەوان هیچیان پێ نەبەخشیووم، ئەمە زامە قوڵەکانن. هەرچەندە ئازاربەخشن بەڵام بیرهێنەرەوەی عەشقن. هیوادارم ئەوانیش رۆژێك بگەڕێنەوە و ئەم زامە قوڵانە بەو پارچەیە پڕ بکەنەوە کە من چاوەڕوانی بووم، ئێستا ئەزانی کە جوانیی راستەقینە چییە؟ پیاوە گەنجەکە بێ ئەوەی قسە بکات وەستا لەکاتێکدا کە فرمێسك لە چاوانی دەهاتە خوار چووە لای پیرەمێردەکە، لە دڵە ساغەکەی خۆی پارچەیەکی بۆ پیرەمێرد لێ کردەوە و بە دەستە لەرزۆکەکانی پێشکەشی پیاوە پیرەکەی کرد، پیرەمێردەکەش وەریگرت و لەسەر گۆشەیەکی دڵی دانا و بەشێك لە دڵە پیر و زامدارەکەی خۆی خستە سەر شوێن برینی پیاوە گەنجەکە. پیاوە گەنجەکە سەیرێکی دڵی کرد، چیتر ساغ نەبوو، بەڵام لە هەموو کاتێك جوانتر بوو، چونکە عەشق لە دڵی پیرەمێردەکەوە بەناو دڵی ئەودا بڵاو ببووەوە.

## دانایی

شێخ محەمەد تەقی باڵوڵ، دوای ۳٦ ساڵ دوورەوڵاتی و گەڕانەوە بۆ ئێران لە وەڵامێکدا بۆ سەرۆکی دەزگای (ساواك) لەبارەی ترس لە مەرگ وتی:

کەسێك کە هەندێ لە کەس و کاری لە مەشهەد بن و هەندێکیان لە تاران، بۆی فەرق ناکات چ ئەوەی کە لە مەشهەد بژی یان لە تاران، من ئێستا لەو حاڵەتەدام. باوك و دایك و خوشك و هەندێ لە کەسە ئازیزەکانم چوونەتە ئەو دنیا و هەندێکی تریان لەم دنیایەدان، بۆ من فەرقی نییە لەم دنیایەدا بم یان لەو دنیادا.

لە هەر کوێیەك بم لای کەس و کاری خۆمم...

# شەیتان

پیاوێك خۆی وەكو شەیتان گۆڕی و چووە میوانداریيەك كە بە بۆنەی جەژنی (هالۆوین) رێكخرابوو.

لە رێگادا باران باری، بۆیە خۆی خستە ناو كەنیسەیەكەوە كە تیایدا مەراسیمێك جێبەجێ دەكرا. خەڵكی بە بینینی پۆشاكە شەیتانییەكەی، بەرەو دەرگا و پەنجەرەكان رایانكرد.

قۆڵی چاكەتی خانمێك بە دەسكی كورسییەكەوە گیر بوو و هەر كە پیاوە پۆشاك شەیتانییەكە لێی نزیك و نزیكتر كەوتەوە، خانمەكە دەستیكرد بە پاڕانەوە: شەیتان، من بیست ساڵە كە ئەندامێكی وەفاداری ئەم كەنیسەیەم، بەڵام لەراستیدا دڵم هەر لای تۆ بووە.

# زانستی راستەقینە

غەزالی، زانای بەناوبانگی ئیسلام، خەڵکی (توس) بوو کە گوندێکی نزیک مەشهەدە. لەو سەردەمەدا، واتە دەوروبەری سەدەی پێنجەمی کۆچی، نیشابور ناوەندی زانست و کەلتووری ئەو ناوچەیە بوو بە دارالعالم هەژمار دەکرا. فێرخوازانی زانست لەو ناوچەیەدا بۆ فێربوون و خوێندن دەچوونە نیشابور. غەزالیش بەو شێوەیەی کە باو بوو هاتە نیشابور و گورگان و سالانێك لە کۆڕی مامۆستا و پایەدارەکان بە ئیرادەیەکی زۆرەوە شت فێر بوو بۆئەوەی زانیارییەکانی فەرامۆش نەکرێن، بەردەوام دەینوسینەوە و دەیکردنە نامیلکە. ئەمانەش کە بەرهەمی سالانێك لە ماندووبوونی بوون، وەکو رۆحی خۆی خۆشی دەویستن.

پاش سالانێك، ویستی بگەڕێتەوە نیشتمان. بۆیە نامیلکەکانی رێکخست و خستییە پرێسکەیەکەوە و لەگەڵ کاروان گەڕایەوە ولات.

بە رێکەوت کاروانەکە رووبەرووی کۆمەڵێك دز و چەتە بووەوە. ئەوان پێش کاروانەکەیان گرت و هەرچی کالا و پارە بوو کۆیان کردەوە.

نۆرە گەیشتە غەزالی و کەرەستەکانی. هەر کە دەستی چەتەکان گەیشتە ئەو پرێسکەیە، غەزالی دەستیکرد بە پاڕانەوە و وتی: (جگە لەمە، هەرچییەکم هەیە بیبەن و واز لەمە بێنن).

دزەکان پێیان وابوو ئەبێ کاڵای گرانبەها لەناو ئەم پرێسکەیەدا هەبێ. پرێسکەکەیان کردەوە و جگە لە کۆمەڵە کاغەزێکی رەش هیچی تریان بەدی نەکرد.

وتیان: (ئەمانە چین و بە کەڵکی چی دێن؟)

غەزالی وتی: (هەرچییەك بێت بەکەڵکی ئێوە نایەت، بەڵام بە کەڵکی من دێن).

–(کەڵکی چییان بۆ تۆ هەیە؟)

–ئەمانە بەرهەمی چەند ساڵێك خوێندنن. ئەگەر ئەمانەم لێ بسەنن ئەوا زانیارییەکانم ئەفەوتێن و ساڵانێك ماندووبوونم لە رێگەی فێربوونی زانستدا بەهەدەر دەچێت).

–بە راست زانیاریی تۆ هەرئەوەیە کە لێرەدایە؟)

–بەڵێ

–(زانستێك کە شوێنەکەی لەناو بوخچەدابێت و بدزرێت، زانست نییە، برۆ بیرێك لە حاڵی خۆت بکەرەوە).

ئەم قسە بازاڕییانە، تەکانێکی دایە رۆحیەتی ئامادە و هۆشیارانەی غەزالی. ئەو کە تا ئەو رۆژە پێی وابوو تەنیا ئەگەر وەکو بەبەغا گوێ لە مامۆستا بگرێت و لە دەفتەرەکاندا بینووسێتەوە بەسە، بەڵام لەوە بەدوا بیری لەوە کردەوە کە کۆشش بکات تا مێشکی خۆی بە فیکر پاراو بکات، زیاتر بیر بکاتەوە، زیاتر فێر بێت و بابەتی بەکەڵك لە دەفتەری زیهنی خۆیدا تۆمار بکات. غەزالی دەڵێت: (من باشترین پەندەکان کە بوونە رێنوێنی فیکریم، لە دزێکی رێگرەوە گوێبیست بووم).

# فریشتەکان چۆن چۆنین؟

وەکو ئەو خانمە پیرە بچکۆلەیەی کە دوێنێ جزدانی پارەکەی بۆ گەڕاندیتەوە.

وەکو ئەو شۆفێرەی تاکسی کە پێی وتیت: کاتێك بزەیەك ئەکەیت چاوەکانت هەموو دنیا رووناك دەکەنەوە.

وەکو ئەو منداڵە بچکۆلەیەی کە شتە سەرسوڕهێنەرەکان لە شتی سادەدا پیشانی تۆ ئەدات.

وەکو ئەو پیاوە هەژارەی کە پێشنیار دەکات نانی نیوەڕۆ لەگەڵ تۆدا بەش بکات.

وەکو ئەو پیاوە دەوڵەمەندەی کە پیشانت ئەدات ئەگەر ئیمانت هەبێ هەموو ئەمانە ئاسانن.

وەکو ئەو غەریبەیەی کە لە وەختێکدا کە رێگات ون کردووە پەیدا دەبێ.

وەکو ئەو هاوڕێیەی کە کاتێك هیچ کەس نەماوە دەست لە دڵت ئەدات.

فریشتەکان بە هەموو ئەندازە و شێوەیەك، لە هەموو تەمەن و بە هەموو جۆرە پێست و پۆشاکێك دێن.

هەندێکیان روخساریان پەڵە پەڵاوییە، هەندێکیان چەناگەیان چاڵە، هەندێکیان روخسارییانە گنجاوییە و هی هەندێکیان رێکە.

ئەوان لە بەرگی دۆست، دوژمن، مامۆستا، فێرخواز، عاشق و گەمژە دێن.

ئەوان ژیان زۆر بە هەند وەرناگرن. ئەوان بە بەبێ هیچ شتێك سەفەر دەکەن.

ئەوان هیچ شوێنەوارێك لەدوای خۆیان جێ ناهێڵن.

کاتێك چاوەکانتان نوقاوە دۆزینەوەیان قورسە.

کاتێك چاوەکانتان کراوەیە لە هەموو شوێنێك هەن، کەواتە وەرن با ببینین.

# چیرۆکی عاشق

رۆژێکیان پیرێکی دانا یەکێك لە قوتابییەکانی بینی کە لە گۆشەیەکدا بە خەمباری دانیشتووە. چووە لای و لێی پرسی. قوتابییەکە دەمی کردەوە و باسی بێ ئەمەکی یارەکەی کرد و ئەمەی کە کچە دڵخوازەکەی رەفزی پێداوە و پێشنیاری هاوسەرگیریی کەسێکی تری قبوڵ کردووە. قوتابییەکە وتی ساڵانێکی زۆرە عەشقی کچەکەی لەدڵیدا پاراستووە و بە رۆشتنی کچەکە بۆ ماڵی پیاوێکی تر، هەست دەکات کە دەبێ بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لە عەشقەکەی بکات.

مامۆستا پیرەکە بە بزەیەکەوە وتی: بەڵام عەشقی تۆ بۆ کچەکە چ پەیوەندی بەوەوە هەیە؟

قوتابییەکە بە سەرسوڕمانەوە وتی: بەڵام ئەگەر ئەو نەبووایە ئەم عەشق و جۆش و خرۆشەش نەدەبوو؟!

مامۆستا پیرەکە بە بزەیەکەوە وتی: وا نییە، تۆ ئەهلی دڵ و عەشقیت و هەر بۆیە ئاگری عەشق تۆی کردووەتە ئامانج. ئەم هیچ پەیوەندی بە کچەکەوە نییە. هەر کەسێکی تریش لە شوێنی ئەو کچە بووایە تۆ ئەم ئاگرەی عەشقەت تێی بەرئەدا. لێگەڕێ کچە بڕوات! ئەم عەشقە ئاراستەی کچێکی تر بکە. گرنگ ئەوەیە کە بڵێسەی ئەم عەشقەت نەکوژێنیتەوە. مەعشوق فەرق ناکات چ کەسێك بێت! کچەکە ئەگەر رۆیشتووە، بە رۆیشتنی پەیامی ئەوەی پێگەیاندوویت کە شایستەی ئەم ئاگرە بەنرخە نییە.

چەنێك باشتر! لێگەڕێ بڕوات تاوەکو خاوەنی راستەقینەی ئەم جۆش و خرۆشە دەرفەتی دەرکەوتن بدۆزێتەوە! هەروا بە ئاسانی!!

# چیرۆکی قەڵەم رەنگەکان

هەموو قەڵەم رەنگەکان سەرقاڵ بوون...جگە لە قەڵەمی سپی. هیچ کەسێك ئیشی نەدەدایە. هەمووان دەیانگوت: (تۆ بە کەڵکی هیچ نایەیت).

شەوێکیان کە قەڵەم ڕەنگەکان لەناو رەشایی کاغەزدا بزر ببوون، قەڵەمی سپی تاوەکو بەیانی ئیشی کرد...وێنەی مانگی کێشا...وێنەی مانگەشەوی کێشا...و ئەوەندە ئەستێرەی دروست کرد کە بچوك و بچوکتر بووەوە...بۆ سبەی لەناو پاکەتی قەڵەم رەنگەکاندا شوێنی ئەو بە هیچ رەنگێك پڕ نەکرایەوە.

***

# ئاوێنە وەکو شێوەی تۆ دەردەکەوێت

**راست....**

پیرەژنێك سەیری ئاوێنەی دەکرد، چاوەکانی بینی کە چاڵ ببوون، روخساری گنجاوی ببوو و رەنگی پەڕیبوو.

لەبەر خۆیەوە وتی: دیارە وەکو پێشوو ئاوێنە دروست ناکەن.

# پیاوه چاکه‌کان

رۆژێکیان حه‌زره‌تی موسا به خواوه‌ندی مه‌زنی وت: حه‌ز ده‌که‌م یه‌کێك له به‌نده چاکه‌کانت ببینم. ده‌نگێك وه‌ڵامی دایه‌وه: بچۆره بیابان، پیاوێکی لێیه که خه‌ریکی کشتوکاڵه. ئه‌و له به‌نده پیاوچاکه‌کانی ئێمه‌یه. حه‌زره‌ت هات و سه‌یریکرد پیاوێك خه‌ریکی خاکه‌ناز لێدان و کارکردنه. حه‌زره‌ت پێی سه‌یر بوو که چۆن گه‌یشتووه‌ته پله‌یه‌ك که خودا ده‌فه‌رموێ له پیاوچاکانی ئێمه‌یه. له جوبره‌ئیلی پرسی. جوبره‌ئیل وتی: ئێستا خودا به‌ڵایه‌کی به‌سه‌ر دێنێت و بزانه له‌به‌رانبه‌ر ئه‌م به‌ڵایه‌دا چی ئه‌کات. به‌ڵاکه هات و ئه‌و پیاوه له یه‌ك ساتدا هه‌ردوو چاوی له‌ده‌ستدا، ده‌ستبه‌جێ دانیشت و خاکه‌نازه‌که‌شی هێنایه به‌رده‌م خۆی.

وتی: گه‌وره‌م تا ئه‌و کاته‌ی که تۆ منت به چاوه‌کانمه‌وه قبوڵ بوو، چاوه‌کانم خۆش ده‌ویست، ئێستا که تۆ منت کوێر کردووه، زیاتر حه‌زم له کوێرییه نه‌ك بینین.

فرمێسك رژایه چاوه‌کانی حه‌زره‌ت، روویکرده پیره‌پیاوه‌که و فه‌رمووی: (ئه‌ی کابرا من پێغه‌مبه‌ری خودام و وه‌ڵامگۆی بانگه‌کانم. ده‌ته‌وێ نزا بکه‌م تاوه‌کو خودا دووباره بینایی به به‌ر چاوه‌کانتدا بکاته‌وه؟)

پیاوه‌که له وه‌ڵامدا وتی: (نا)

حه‌زره‌ت فه‌رمووی: (بۆچی؟)

وتی: (ئه‌وه‌ی که په‌روه‌ردگارم بۆ هه‌ڵبژاردووم زیاتر به‌دڵمه نه‌ك ئه‌وه‌ی خۆم بۆ خۆمم ئه‌وێ).

# سیانزە دێڕ بۆ ژیان

١-خۆشم دەوێیت، نەك لەبەر کەسایەتی تۆ، بەڵکو لەبەر ئەو کەسایەتییەی کە من لەو کاتەی لەگەڵ تۆم بەدەستی دێنم.

٢-هیچ کەسێك شایستەیی فرمێسکەکانی تۆی نییە و کەسێك کە نرخێکی وەهای هەیە نابێتە هۆکاری فرمێسك رشتنی تۆ.

٣-ئەگەر کەسێك بەو شێوەیەی کە خۆت دەتەوێ خۆشی ناوێیت، بەو مانایە نییە کە تۆی لە ناخی دڵەوە خۆش ناوێت.

٤-هاوڕێی راستەقینە کەسێکە کە دەستەکانی تۆ بگرێت بەڵام هەست بە دڵت بکات.

٥-خراپترین شێوەی دڵتەنگی بۆ کەسێك ئەوەیە کە لە لای بیت و بزانیت کە هەرگیز پێی ناگەیت.

٦-دەشێ تۆ لە هەموو دنیادا یەك کەس بیت، بەڵام بۆ هەندێ کەس هەموو دنیایت.

٧-قەت کاتت لەگەڵ کەسێکدا بەسەر مەبە کە ئامادە نییە کاتی لەگەڵ تۆدا بەسەر ببات.

٨-دەشێ خودا ویستبێتی کە سەرەتا کەسانێکی نەگونجاوی زۆر بناسیت و پاشان کەسێکی گونجاو، بەمشێوەیە کاتێك ئەوت دۆزیەوە باشتر دەتووانیت سوپاسگوزار بیت.

٩-بۆ ئەو شتە خەم مەخۆ کە تێپەڕی، پێبکەنە بۆ ئەو شتەی کە دێت.

١٠-هەمیشە کەسانێك هەن کە ئازارت دەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە متمانە بەوانیتر بکە و تەنیا ئاگادار بە کە کەسێك کە تۆی ئازار داوە، جارێکی تر متمانەی پێ نەکەیتەوە.

١١-خۆت بکە بە کەسێکی باشتر و دڵنیا بە کە خۆت ئەناسیت پێش ئەوەی کە کەسێکی تر بناسیت و چاوەڕوان بیت کە ئەو بتناسێت.

١٢-لە رادەبەدەر خۆت مەخەرە ژێر گووشارەوە، باشترین شت لە کاتێکدا روودەدات کە چاوەڕوانی ناکەیت.

١٣-هەرگیز واز لە بزە مەهێنە، تەنانەت ئەو کاتەش کە نارەحەتیت چونکە دەشێ کەسێك عاشقی بزەکەی تۆ بێت.

# باقی و فانی

لە زاری عایشەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی، ڕۆژێکیان مەڕێکمان سەربڕی و پێغەمبەر (د.خ) هەموو پارچەکانی ئەو گۆشتەی بەخشییە ئەوانیتر و تەنیا لا ڕانێکی مەڕەکە مایەوە.

من بە پێغەمبەرم وت: (پێغەمبەری خودا (د.خ) تەنیا لا ڕانێکی مەڕەکە ماوەتەوە). پێغەمبەری خودا فەرمووی: (هەرچی ئەوەی کە بەخشیومانە ماوەتەوە، جگە لەم لا ڕانە).

## هەندێ جار

هەندێ جار مرۆڤ حەز دەکات پێڵاوەکانی داکەنێت

لەسەرخۆ لەسەر نوکە پێیەکانی لە خۆی دوور بکەوێتەوە،

پاشان بۆی دەرچێ،

لە خۆی رابکات...

لەگەڵ خۆماندا چیمان کردووە...!؟

## مامۆستا و قوتابی چاویان بە یەکتری دەکەوێت

یەکێك لە قوتابییانی سانجای گورو ئەوەندە ئیمانی پێی هەبوو کە جارێکیان بۆ کەناری رووبارێك بانگی کرد.

(...مامۆستا، ئەوەی لە تۆ فێری بووم، ژیانی گۆڕیووم. توانیم ژیانی هاوسەرێتیم بونیاد بنێمەوە، لە مشتومڕە خێزانییەکاندا بارودۆخی خۆم باش بکەم و یارمەتی هاوتاکانم بدەم. هەر شتێك کە لە کۆتاییدا بە ناوی تۆ و بە ئیمان بردن بە تۆ بمەوێ، بەدەستی دێنم).

سانجای روانییە قوتابییەکەی و دڵی قوتابییەکە پڕ بوو لە شانازی.

قوتابییەکە لە کەناری رووبارەکە نزیك کەوتەوە و وتی:

(باوەڕم بە ئامۆژگاری و رۆحانیەتی تۆ ئەوەندە بەهێزە کە ئەوەندە بەسە ناوی تۆم بەدەمدا بێت تا بتوانم بەسەر ئاودا بڕۆم). پێش ئەوەی کە مامۆستا بتوانێت شتێك بڵێت، قوتابییەکە چووە ناو رووبارەکە و هاواریکرد: (پاکە، سانجای! پاکە سانجای!)

هەنگاوێکی هەڵێنا و بەدوایدا هەنگاوێکی تر.

هەنگاوی سێیەم، جەستەی بەرز بووەوە و بێ ئەوەی کە پێیەکانی تەڕ ببێت توانی خۆی بگەیەنێتە ئەوبەری رووبار.

سانجای بە سەرسوڕمانەوە روانییە شاگردەکە کە بە خەندەوە لەوبەری رووبارەوە دەستی رادەوەشاند. بیری کردەوە: (دەتەوێ بڵێیت لەوە روونبینترم کە

خۆم بیری لێ دەکەمەوە؟ دەتووانم بەناوبانگترین پەرستگای ناوچەکەم هەبێت! دەتووانم بچمە پاڵ گەورەترین (گورو) و قەدیسان!) بڕیاریدا کاری قوتابییەکەی دووبارە بکاتەوە، چووە کەناری رووبارەکە، هەنگاوی بەرەو پێشەوە نا و هاواری کرد: (پاکە سانجای! پاکە سانجای) هەنگاوی یەکەمی هەڵێنا، هەنگاوی دووەم و کاتێك هەنگاوی سێیەمی نا، کەوتە ناو ئاوەکەوە. مەلەی نەدەزانی و قوتابییەکەی ناچار بوو خۆی هەڵداتە ناو ئاوەکەوە تاوەکو لە مردن رزگاری بکات. کاتێك ماندوو و هەناسەلێبڕاو گەیشتنە کەناری رووبارەکە، سانجای ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو و سەرەنجام وتی: (هیوادارم ئەوەی کە ئەمڕۆکە روویدا، ژیرانە دەرکت کردبێت. من تەنیا نوسراوە پیرۆزەکان و شێوازی دروستی رەفتارم فێری تۆ کردووە. بەڵام ئەمانە سوودیان نەبوو، مەگەر ئەوەی کە تۆ وانەکانی منت قبوڵ بکردایە، باوەڕت هێنا بەوەی کە ئەم وانانە دەتووانن ژیانی تۆ باشتر بکەن. فێرم کردیت، چونکە مامۆستاکانم منیان فێر کردبوو. بەڵام سەروەختێك کە من وانەم دەوتەوە و دەمخوێندەوە، تۆ ئەوەی کە فێری دەبوویت بەکارت دەهێنا. سوپاسگوزارم کارێکت کرد کە من تێبگەم زۆرجار مرۆڤ خۆی باوەڕی بە شتێك نییە کە حەز دەکات ئەوانیتر باوەڕی پێ بکەن.

## حەزرەتی سلێمان و ژیشك

لە چیرۆکەکان و مێژوودا ئەگێڕنەوە کە کاتێك جوبرەئیل سلاوی خوای لێ بێت هاتە لای پێغەمبەر سلێمان، سوراحییەك ئاوی حەیاتی هێنا و وتی: ئەفرینەری بالا تۆی سەرپشك کرد، بزانە ئەگەر لەم جامە بخۆیتەوە ئەوا تا قیامەت زیندوو دەبیت. سلێمان لەمبارەیەوە لەگەڵ جن و مرۆڤەکان و ئاژەڵەکاندا راوێژی کرد. هەمووان وتیان: دەبێ بیخۆیتەوە تاوەکو ژیانی نەمریت دەست کەوێ. سلێمان لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە ئاخۆ ئەبێ ئاژەڵێك مابێت راوێژی لەگەڵدا نەکردبێت؟ لەپڕ هاتەوە بیری کە لەگەڵ ژیشکدا راوێژی نەکردووە، بۆیە ئەسپەکەی ناردەی لای ژیشك و داوای کرد. ژیشك نەهات. حەزرەتی سلێمان سەگی لەدوا نارد. ژیشك هات. سلێمان وتی: پێش ئەوەی لە کارەکەی خۆمدا راوێژت پێ بکەم، پێم بڵێ بۆچی ئەسپم لەدوا ناردی نەهاتی لەکاتێکدا کە لەدوای مرۆڤ هیچ گیانلەبەرێك لەو شەریفتر نییە؟ سەگیش نزمترین ئاژەڵە و لەدواتم نارد کەچی هاتی، حیکمەت چی بوو؟ وتی: هەرچەندە ئەسپ ئاژەڵێکی شەریفە، بەلام بەئەمەك نییە و سەگ ئەگەرچی نزمە بەلام بەئەمەکە چونکە لە بەرانبەر ئەو نانەی کە لە کەسێکی وەردەگرێت تا کۆتایی تەمەن وەفادار دەبێ لەگەڵیدا. بۆیە بە قسەی بێ وەفایان نەهاتم و بە ئاماژەی وەفاداری زوو هاتم.

بۆیە سلێمان وتی: جامێك ئاوی حەیاتیان بۆ ناردووم و سەرپشکیان کردووم کە ئەگەر بمەوێ بیخۆمەوە و ئەگەر نەمەوێ نەیخۆمەوە. هەموویان بۆچوونیان وایە کە بیخۆمەوە، تۆ چی ئەڵێیت؟ وتی: تۆ ئەم جامە بە تەنیا دەیخۆیتەوە، یان لەگەڵ منداڵ و دۆستانت؟ وتی: منیان بە تەنیا فەرموو کردووە. ژیشك وتی: کەواتە وا دروستە کە نەیخۆیتەوە و رەتی بکەیتەوە.

وتی: بۆچی؟ ژیشك وتی: چونکە کە ژیانی تۆ درێژ ببێت، هەموو دۆستان، ژن و منداڵەکانت پێش دەمرن و بۆ هەر خەمێکت هەزار خەم زیاد دەبێت و کە دۆست و کەسانت نەبن، ژیان بێ ئەوان بەکەڵکی چی دێت؟ سلێمان ئەو بۆچوونەی قبوڵ کرد و ئاوەکەی رەت کردەوە.

## هەڵە

(ئەکبەر)ی ئیمپراتۆری هیندستان داوای لە بیربال(ی وێنەکێش)ی کۆشك کرد لە ماوەی شەش رۆژدا وێنەی روخساری بکێشێت. پاش تەواوکردنی کارەکە و خستنەرووی وێنەکە، ئەکبەر داوای لە هەشت وێنەکێشی کۆشك کرد بۆچوونی خۆیان دەرببڕن، هەرکامێکیان خاڵێك لەسەر ئەو بەشەی نیگارەکە دانا کە پێیان وابوو کەموکوڕی هەیە. بیربال کەمێك بیری کردەوە و پاشان داوایکرد هەشت لاپەڕەی سپی بۆ هاوکارەکانی بێنن تاوەکو روخسارەکە بەبێ کەموکوڕی بکێشن. هیچ کامیان ئامادەی ئەنجامدانی ئەو کارە نەبوو و ئەکبەر بە چاوە نیگەرانەکانی و بە نارەحەتییەوە لەژێر لێویەوە قسەی دەکرد:

دۆزینەوەی کەموکوڕی لە کاری ئەوانیتردا ئاسانە، بەڵام ئەگەر خۆتان بتانەوێ هەمان کار ئەنجام بدەن، ئەو کاتە پەی بە سەختی کارەکە دەبەیت.

## بزماری سەر ڕێگا

## (دەستنیشانکردنی مەترسییەکان و هەڕەشەکان)

کابرایەك بە مەبەستی زانینی کاردانەوەی ئەوانیتر بەرانبەر بابەتەکە، بزمارێکی خستە ناو چوارچێوەی دەرگای شوێنی کارەکەی. یەکەم کەس کە چووە ناوەوە بەبێ ئەوەی بزمارەکە ببینێت ڕەت بوو. کەسی دووەم کە لە چوارچێوەی دەرگاکە ڕەت دەبوو بزمارەکەی بینی بەڵام بێ ئەوەی گرنگی پێ بدات ڕۆیشت. کەسی سێیەم بزمارەکەی بینی و لای خۆیەوە وتی: ئەو کاتەی ئیشەکەم تەواو بوو دەگەڕێمەوە و بزمارەکە لە چوارچێوەکە دێنمە دەرەوە تاوەکو مەترسی بۆ کەس دروست نەکات. کەسی چوارەم بە بینینی بزمارەکە و زانینی مەترسی لە شوێنەکە، دەستبەجێ پلایسێکی هێنا و بزمارەکەی هەڵکێشا و پاشان پرژایە سەر کارەکەی.

هەموو کەسێك لەبەرانبەر بابەتەکاندا کاردانەوەیەکی هەیە، کەسی یەکەم ئاستێکی زانینی نزمی هەبوو بەرانبەر دەوروبەری خۆی. کەسی دووەم زانینێکی سەرەتایی هەبوو، بەڵام هەستی بەرپرسیارێتی بەرانبەر مەترسی ئەو بابەتە بۆ ئەوانیتر نەبوو. کەسی سێیەم زانین و بەرپرسیارێتی هەبوو بەڵام لە ڕوانگەی کاتەوە نەیڕوانیە بابەتەکە و پەی بە بایەخی بابەتەکە نەبرد. کەسی چوارەم تێگەیشتنێکی بەرزی بۆ بابەتەکە هەبوو و مەترسییەکانی دەوروبەری دەرك دەکرد.

## روانینی خەیام بۆ بەهای شادی

رۆژێکیان کەسێك روویکردە خەیامی ژیر کە سالآنی پیری بەسەر دەبرد، و وتی: تۆ کتومت بیرتە باپیرەی من چ کاتێك مرد؟!

خەیام لێی پرسی: ئەم پرسیارە بۆچییە؟

ئەو گەنجە وتی: من مێژووی کۆچی دوایی هەموو کەسی خۆم بەدەستهێناوە و دەمەوێ رۆژی مردنیان برۆمە گۆرستان و نزایان بۆ بکەم و خێریان بۆ بکەم و...

خەیام پێکەنی و وتی: تۆ مرۆڤێکی بەدبەختیت! خواوەند تۆی ناردووە تاوەکو شادی بهێنیتە کایەوە و دەستی زیندووان و پەککەوتەکان بگریت تا نەمرن. تۆ بەدوای مردووەکانتەوەیت؟...!

پاشان پشتی تێکرد و وتی من کارم بە مردووپەرستان نییە و لێی دوور کەوتەوە.

بیرمەندی ولآتەکەمان (ئەرد)ی گەورە دەلێت:

(نقومبوون لە خەمەکاندا نامانگەیەنێتە خۆشبەختی)

و هەروەها لە شوێنێکی تردا دەلێت:

(ئەوەی کە نالە و زاری دائەچێنێت، دلرزانی ژیانی هەلدەگرێتەوە).

هیوادارم هەموومان بەهای ژیان بزانین و بۆ شادیی یەکتری کۆشش بکەین.

## وەڵامی ناشایستە

قسەی ناشیرینیان بە دانایەك وت. ئەو هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.
بە داناکەیان وت: ئەی دانا، بۆچی وەڵامت نەدایەوە؟
دانا وتی: چونکە ناچمە ناو دارستانێکەوە کە براوەکەی لە دۆڕاوەکەی خراپترە.

## لیستی کارە بنچینەییەکان

(کارلوس چاوب)ی ملیۆنەری ئەمریکی لە ساڵی ١٩٣٦دا ٢٥٠٠ دۆلار خەڵاتی بۆ باشترین ئامۆژگارییەك تەرخان کرد کە پێی بڵێت چۆن کەڵك لە سەرچاوە گرانبەهاکان وەربگرێت. هەزاران ئامۆژگاری رێنمایی بۆ نێردرا و لە کۆتاییدا ئەم ئامۆژگارییەی هەڵبژارد: رۆژەکەت بە بەلیستکردنی ئەو کارە بنچینەییانە دەست پێبکە کە دەتەوێ ئەنجامیان بدەیت. هەڵبەت دوای ئەوەی کە کارە ناچیز و رۆتینییەکانت بەلاوەنا.

## چەنێك باش ئەبوو ئەگەرا.....

زانیاریمان لەگەڵ ئەقڵ تێکەڵ نەکردبایە و

عەشقمان لەگەڵ هەوەس و

راستیمان لەگەڵ واقیع و

وریاییمان لەگەڵ ترس و

دەستکەوتمان لەگەڵ لاسایی و

ئازادبوونمان لەگەڵ ئازادی و

مەزنایەتیمان لەگەڵ گەورەبوون و

شەهوەتمان لەگەڵ خۆشەویستی و

دڵپاشیمان لەگەڵ لاوازی دەروون و

ئارامگرتنمان لەگەڵ بێباکی و

سیاسەتمان لەگەڵ ناپاکی بە هەڵە لێك نەدابایەوە و

راشکاویمان لەگەڵ ئیهانە و

راستیمان لەگەڵ بەرژەوەندی و

بەرژەوەندیمان لەگەڵ سوودخوازی

لاساییکردنەوەی ئاگایانەمان لەگەڵ شوێنکەوتنی کوێرانە و

کارمان لەگەڵ سەرقاڵی و

خۆشویستنمان لەگەڵ قبوڵبوون و

قبوڵ نەبوونمان لەگەڵ رێزنەگرتن و

گاڵتەکردنمان لەگەڵ دڵشکان و

پێویستەی حقوقیمان لەگەڵ پێویستەی ئەخلاقی و

ئاومان لەگەڵ سەراب و

ئاسودەییمان لەگەڵ بەختەوەری و

خۆمان لەگەڵ خۆمان! .....لێ تێك نەدەچوو.

## چیرۆکی کورتی ئامۆژگاری

رۆژێکیان گەنجێك داوای ئامۆژگاری لە پیرێك کرد.

وتی: ئەی گەنج قورئان بخوێنە بەر لەوەی قورئانت لەسەر بخوێننەوە!

نوێژ بکە بەر لەوەی کە نوێژت بۆ بکەن!

سوود لە ئەزموونی ئەوانیتر وەربگرە، بەر لەوەی کە ببیتە ئەزموونی ئەوانیتر!

## رەنجی شەیتان

شەیتان بە حەزرەتی یەحیای وت: دەمەوێ ئامۆژگاریت بکەم!

حەزرەتی یەحیا فەرمووی: من ئارەزوومەند نیم بەلام دەمەوێ بزانم چینەکانی خەڵك لای تۆ چۆنن.

شەیتان وتی: خەڵك لە دیدی ئێمەدا بۆ سەر سێ گروپ دابەش دەبن:

١-هەندێکیان وەکو تۆ بێگوناهن، لەوان نائومێدم و دەزانم کە فێڵی من کاریان تێناکات.

٢-گروپێکی تر بە پێچەوانەوەن و لای من وەکو تۆپ وەهان و بۆ کوێ شەقیان تێهەڵدەین بۆ ئەوێ دەڕۆن.

٣-گروپێکیش هەن کە بەدەستیانەوە دەناڵێنم، چونکە لەخشتە دەبرێن، بەلام دواتر لە کرداری خۆیان پەشیمان دەبنەوە و تۆبە دەکەن و هەموو زەحمەتەکانم بەفیڕۆ دەبەن و جارێکی تر لەگەڵ نزیکبوونەوەم لە سەرکەوتن، دیسان دەکەونەوە یادی خودا و لە چنگم رادەکەن. من بەردەوام بەدەست ئەو کەسانەوە دەناڵێنم.

# توانای ڕاستەقینە

(رامـان یـوگی) مامۆسـتای موسـڵمانی هونـەری تیرهاوێـژی بـوو. ڕۆژێکیـان خۆشەویسـترین قوتـابیی خـۆی بـۆ نمایشـی هونەرەکـەی بانگهێشـت کـرد. قوتابییەکەی زیاتر لە سەد جار ئەم بەرنامەیەی بینیبوو، بەڵام بڕیاریدا پەیڕەوی لە بڕیاری مامۆستاکەی بکات. چوونە بێشـەیەکی نزیـك لـە پەرسـتگاکە، گەیشـتنە دار بەڕوویـەکی جـوان و رامـان لـەناو گوڵـەکانی ئەڵقـە گوڵبەندەکـەی دەوری گـەردنی، گوڵێکی لێکردەوە و لەسەر لقێکی دانا.

پاشان پرێسکەکەی کردەوە و سێ شتی هێنایە دەرەوە: کەوانە جوانە دڵخوازەکەی، تیرێك و دەسەسرێکی سپی کە گوڵی یاسی لەسەر چنرابوو.

لە دوورایی سەد پێی گوڵەکەوە، بەرانبەر ئامانجەکەی وەستا و داوای لە قوتابییەکەی کرد کە بە دەسەسرە چاوەکانی ببەستێت. قوتابییەکە فرمانی مامۆستاکەی جێبەجێ کرد.

مامۆستا لێی پرسی: تاوەکو ئێستا چەند جار منت لە حاڵەتی پرۆڤەی هونەری رەسەن و دێرینی تیرهاوێژیدا بینیووە؟

قوتابییەکە وتی: هەموو ڕۆژێك و هەمیشە لە دوورایی سێسەد پێ گوڵێکی سورت پێکاوە.

(رامان یوگی) بە چاوانی بەستراوەوە، شوێنپێکەی لەسەر زەوی قایم کرد، بەوپەڕی هێزەوە تیرەکەی راکێشا، سێرەی لە گوڵە سورەکەی سەر لقی دار بەڕووەکە گرتەوە، و تیرەکەی بەردا.

تیرەکە بە گیڤەیەکەوە دەرچوو، بەلاّم بە دوورابیەکەی زۆرەوە کورتی هێنا و تەنانەت بەر درەختەکەش نەکەوت.

(رامان یوگی) دەسەسڕەکەی لەسەر چاوەکانی لابرد و پرسی: بەر ئامانجەکە کەوت؟

قوتابییەکە لە وەلاّمدا وتی: (کورتی هێنا...دوورابیەکە زۆر بوو. پێم وایە دەتەویست هێزی تەرکیزکردنم فێر بکەیت و پیشانم بدەیت کە دەتووانیت موعجیزە بێنیتەکایەوە.

رامان لە وەلاّمدا وتی: وانەیەکی زۆر گرنگم لەبارەی هێزەوە بە تۆ گەیاند. کاتێك شتێکت دەوێ تەنیا تەرکیزی بخەرە سەر، هیچ کەسێك ناگاتە ئامانجێك کە نایبینێت.

# ڕەخنەگرتن لە ئامۆژگاری

لاوێکی هۆشمەند کە هەموو کتێبەکانی مامۆستاکەی فێر بووە، بە چاوی بەستراوەوە هەموویان بۆ قوتابییەکانی تر دەخوێنێتەوە.

مامۆستاکەی پێی وت: بە مەرجێك دەهێڵم لە وانەوتنەوەکەدا هاوکاریم بکەیت.

قوتابییەکە وتی: چ مەرجێك؟

مامۆستا وتی: وانە بڵێرەوە، بەڵام ئامۆژگاری پێشکەش مەکە.

قوتابییەکە وتی: بۆچی ئامۆژگاری پێشکەش نەکەم؟

مامۆستا پیرەکە وتی: زانین لە کتێبدا هەیە، بەڵام فێربوونی ئامۆژگاری پێویستی بە ئەزموون و کات هەیە کە تۆ نیتە. ژیری، ئەنجامی فێربوونی زانین و ئەزموونە.

قوتابییەکە وتی: وانەیەکی گەورەت فێر کردم. هەوڵ دەدەم مەرجەکەی تۆ جێ بەجێ بکەم.

دەگێڕنەوە کە، ساڵانێك تێپەڕی و تا مامۆستا زیندوو بوو، کەس ئامۆژگاری پێشکەش نەدەکرد.

(ئەرد)ی گەورە، زانای گەورەی وڵاتەکەمان دەڵێت: وتنەوەی دێڕێکی ڕاست و دروست لەمەڕ ژیان، پێویستی بە سەفەرێکی حەفتا ساڵی هەیە.

# بەخێر بێیت بۆ دنیای سیاسەت

پرسیاری لە کیژۆڵەکە کرد: کاتێك گەورە بوویت دەتەوێ ببیتە چی؟

سەیرێکی کرد و وتی: دەمەوێ ببمە سەرۆك کۆمار.

پرسی: ئەگەر ببیتە سەرۆك کۆمار، یەکەمی کار کە حەز دەکەیت ئەنجامی بدەیت چییە؟

لە وەڵامدا وتی: یارمەتی خەڵکی برسی و بێ ماڵ و حاڵ بدەم.

پێی وت: پێویست ناکات چاوەڕێ بیت کە بوویتە سەرۆك ئەم کارە ئەنجام بدەیت، دەتووانی هەر سبەینێ بێیت ماڵەکەی من پاك بکەیتەوە، چیمەنەکەم کورت بکەیت و پارکینگەکە گسك بدەیت.

ئەو کاتە پەنجا دۆلارت ئەدەمێ و دەتبەمە ئەو شوێنانەی کە منالانی هەژاری لێن و تۆ دەتووانیت ئەم پارەیەیان بدەیتێ تاوەکو بۆ کڕینی خۆراك و جل خەرجی بکەن.

دووبارە سەیرێکی کرد و وتی: بۆچی هەر ئەو منالە هەژارانە نابەیتە ماڵەکەت تاوەکو ئەم کارانە ئەنجام بدەن و هەر ئەو پارەیە بدەیتە خۆیان؟

سەیرێکی کرد و وتی: بەخێر بێیت بۆ دنیای سیاسەت!

## ئەگەر من هێشتا هاوسەرگیریم نەکردووە...
## (دەروونناسیی راکردن لە بەرپرسیارێتی)

خەتای کاتی کارکردنەکەمە کە لەگەڵ قوقەی کەڵەشێر دەردەچم و نیوەشەو دەگەڕێمەوە و شانسی ئەوە نامێنێ کە ببینرێم!

خەتای خوشکەکەمە کە لە مێردەکەی جیا بووەوە و بووەهۆی ئەوەی کە تێڕوانینی هەمووان بەرانبەرمان بگۆڕێت!

خەتای باوکمە کە ئەوەندە پارەی نییە چاوی میللەت دەربێ!

خەتای دایکمە...ئەی نالێن دایك ببینە کچە بەدەست بێنە؟!

خەتای کوڕە مامە کە تێنەگەیشت لەوەی گرێبەستی کچەمام و کوڕەمامیان لە ئاسماندا ئەنجامداوە!

خەتای دایکی مێردی پورمە، دەزانم ئەو بەختی بەستووم!

خەتای کوڕی دراوسێی لای راستمانە کە رێگەی بەخۆیدا خوازبێنیم بکات!

خەتای کوڕی دراوسێی لای چەپمانە کە رێگەی بە خۆی نەدا خوازبێنیم بکات!

خەتای تەلەڤزیۆنە کە لەناو هەموو زنجیرەکاندا هەموو گەنجەکان هاوسەرگیری دەکەن و بەهیچ شێوەیەك ناپرژێتە سەر کێشەکانی ئێمەی گەنجە بێ هاوسەرەکان!

خەتای چاپەمەنییە کە لەناو بابەتەکانیاندا هەموو گەنجەکان جیا دەبنەوە و خەڵکی لەبەرانبەر هاوسەرگیریدا رەشبین دەکەن!

خەتای دەوڵەتە کە بیرێك لە چارەسەرکردنی قەیرانی هاوسەرگیریی گەنجەکان ناکاتەوە!

خەتای پەرلەمانە کە لەبری سەربازییپێکردنی ناچاری، کوڕەکان ناچاری هاوسەرگیری ناچاری ناکات!

خەتای خەڵکە کە شۆڕشیان کرد و بوونە هۆی ئەوەی کە قوتابخانە تێکەڵاوەکان هەڵبگیرێن!

خەتای سەرۆك کۆمارە کە نایەت من بۆ کوڕەکەی بخوازێت!!؟

خەتای عێراقە کە ژمارەیەکی زۆری کوڕانی ئامادەی هاوسەرگیری لێ بەکوشتداین!

خەتای بەریتانیایە، ئەمە هەر گومانی تیا نییە. هەمووان دەزانن کە هەمیشە و لە هەموو شوێنێك، دەستی ئینگلیزی تێدایە!

خەتای رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە کە لەسەر دەرگاکەی نوسراوە: (مرۆڤەکان ئەندامانی یەکترین) بەڵام دیاری نەکردووە ئاخۆ من جگەری کێم!

خەتای گۆی زەوییە کە بە جۆرێك نەچەرخا تا من و نیوە ون بووەکەم بگەینە یەکتری!

خەتای مانگە کە لە رۆژی هاتنەدنیام لە بورجی دوپشکدا بووە.

# خۆسەلماندن

لە سینەما تۆ لە ناو کورسی خۆتدا دانیشتوویت تا فیلم دەست پێدەکات. هەر کە فیلم دەستی پێکرد، کۆمەڵێك لە پشت سەری تۆوە دادەنیشن. ئەوان بەبێ لەبەرچاوگرتنی پێگە و هەلومەرجی شوێنەکە دەست دەکەن بە ژاوەژاو و قسەکردن بە دەنگی بەرز. تۆ چی ئەکەیت؟

١-کورسییەکەت دەگۆڕیت و دەچیتە ریزی پێشەوە.

٢-دەگەڕێیتەوە لای ئەو کەسانە، راستەوخۆ دەڕوانیتە ئەو کەسەی کە هەراکەی ناوەتەوە و پێی دەڵێیت: تکایە ناتووانم تەماشای فیلمەکە بکەم. ئەکرێ کەمێك لەسەرخۆ قسە بکەن.

٣-دەچیتە دەرەوە و بەشێك لە فیلمەکە لەدەست خۆت دەدەیت. داواش لە بەڕێوەبەری سینەما دەکەیت ئاگاداریان بکاتەوە.

٤-لە شوێنی خۆت ئەمێنیتەوە و هەوڵ دەدەیت بۆ تێگەیشتن لە گفتوگۆکانی ئەکتەرەکان لە جوڵەی دەمیانەوە حوکم بدەیت.

خۆسەلماندن:

پێناسەی جیاجیا بۆ خۆسەلماندن کراوە. دیدی ئەلبێرتی و ئیمۆنز بەم شێوەیەیە: رەفتارێك کە توانا بە کەسەکە دەدات بە گوێرەی ئارەزووەکانی خۆی بجوڵێتەوە و بەبێ شڵەژان بەرگری لە خۆی بکات. هەروەها بشتووانێت مافە کەسییەکانی خۆی بەباشترین شێوە لەوانیتر بسەنێت.

خۆسەلماندن رەفتارێکە کە تۆ بەهۆیەوە ئارەزووەکانی خۆت ئەگەیەنیتە ئەویتر بێ ئەوەی کە زیان لە هەستەکانی بگەیەنیت.

نموونەگەلێکی رەفتاری خۆسەلمێنەرانە:

—لەبری سکاڵاکردن لای ئەوانیتر، راستەوخۆ لەگەڵ ئەو کەسەی کە کێشەت لەگەڵیدا هەیە ئەدوێیت.

—لەبری رەخنەگرتن لەوانیتر لەگەڵ ئەو کەسەدا ئەکەویتە گفتوگۆ لەبارەی ئەو رەفتارەوە کە ئەیکات و دەبێتە هۆی نارەحەتی تۆ.

—بە کەسی بەرانبەر بڵێ: بۆچی ئەو شتە بەلای تۆوە کێشەیە. بە بەکارهێنانی زمانی(من) ئەم کارە ئەنجام بدە. (ئەم کارەی تۆ مایەی نارەحەتی منە).

—بە کەسی بەرانبەر بڵێ کە حەز دەکەیت چی بکات.

—بە تۆنێکی گونجاو بدوێ، نە زۆر نەرم و نە زۆر بەرز، و پەیوەندییەکی باش لە رێگەی چاوەکانەوە بەرقەرار بکە، بە جۆرێك کە تێبگات مەبەستت چیە. رەفتاری خۆسەلمێنەرانە نە هەڵچووانەیە و نە شەڕانگێزانە. هەروەها رەفتاری نادەربڕینی تایبەتیش هەن کە زۆرجار بەکاری دێنین، بێ ئەوەی کە ئاگاداری مەبەستەکەی بین.

لە بارودۆخە جیاجیاکاندا، ئێمە بەزۆری سێ جۆر کاردانەوە پیشان دەدەین:

١—رەفتاری هەڵچووانە: کورت دێنین و نایپێکین (رەفتاری نادەربڕینی، وەکو قسەی نەرم و پەیوەندیی بینایی لاوان).

٢—رەفتاری تەواو شەڕانگێزانە، رووبەڕووبوونەوەی توند و نالۆژیکی ئەنجام دەدەین (رەفتاری نادەربڕینی وەکو قسەکردن بە ئامادەکردنی مشتەکۆڵەکانەوە)

٣—رەفتاری خۆسەلمێنەرانە، بە لۆژیك و بەڵگەوە ئەدوێین (رەفتاری نادەربڕینیی وەکو قسەکردن بە دەنگی تا رادەیەك بەرز و پەیوەندیی بینایی باش).

ئەرێ بە راست تۆ لە سینەما کام لەو رەفتارانەی کە باسمان کرد ئەنوێنیت؟

## متمانه، دڵنیایی، هیوا...

ڕۆژێکیان هەموو دێهاتییەکان لە دێیەکدا بڕیار دەدەن بۆ باران بارین نزا بکەن. لە ڕۆژی دیاریکراودا هەموویان کۆ دەبنەوە، بەڵام لەو گردبوونەوەیەدا تەنیا کوڕێکی بچوک چەتری لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، ئەمە واتە دڵنیایی.

متمانە

دەبێ متمانە لە هەستی منداڵێك بچێت کە هەڵیدەدەیتە ئاسمان و ئەو پێدەکەنێت چونکە تۆ دەیگریتەوە.

هیوا

هەموو شەوێك دەچینە ناو پێخەف بێ ئەوەی کە دڵنیا بین ئاخۆ سبەی زیندوو دەبین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پلانێکی زۆرمان بۆ سبەی داناوە.

متمانە بە خودا بکەن، لە خۆتان دڵنیا بن و هەرگیز هیوا لەدەست مەدەن.

# فریشتەی چاکە و فریشتەی خراپە

فریشتەی چاکە و خراپە، لە بەرزاییەکانی چیایەك یەکتری ئەبینن.

فریشتەی چاکە وتی:

-رۆژت باش برا.

فریشتەی خراپە وەڵامی نەدایەوە.

و فریشتەی چاکە وتی:

-تۆ ئەمڕۆ خوت خراپ بووە.

فریشتەی خراپە وتی:

-بەڵێ، بەم دواییانە منیان لەگەڵ تۆدا لێ تێك دەچێت. من بە ناوی تۆ بانگ دەکەن و وا رەفتارم لەگەڵدا دەکەن وەك بڵێی من تۆم، ئەمەش بۆ من دڵخواز نییە.

فریشتەی چاکەش وتی:

-بەڵام منیشیان لەگەڵ تۆدا لێ تێك دەچێت و بە ناوی تۆ بانگم دەکەن، فریشتەی خراپە لەکاتێکدا کە نەفرەتی ئاراستەی نەزانی مرۆڤەکان دەکرد، لەوێ دوور کەوتەوە.

# پێ یان پێڵاو؟!

پەنجەکانی پێی لە پێڵاوەکە دەرچووبوون و گیرفانی بەتاڵ بوو!

ڕۆژێکی ئارامبەخشی بەهار بە لای دوکانێکدا ڕەت دەبوو، نائومێدانە ڕوانییە پێڵاوەکان و خەمی نەبوونی هەموو جەستەی داگیر کردبوو.

لەپڕ! گەنجێك لەلایەوە وەستا، سڵاوی کرد و بە خەندەیەکەوە وتی:

چەند ڕۆژێکی جوانە! پیاوەکە هاتەوە سەر خۆی، سەیرێکی گەنجەکەی کرد و سەری سوڕما! گەنجێك جوان، پێی نەبوو. پێیەکانی لە ئەژنۆوە بڕابوونەوە! پیاوەکە بە سەرگەردانییەوە وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە؛ سەری شەرمەزاری شۆڕ کرد و بە عەرەق کردنەوە دوور کەوتەوە.

چەند ساتێك دواتر، ئەقڵ یەخەی گرتبوو و سەرزەنشتی دەکرد: (خەفەتی ئەوەت هەبوو کە پێڵاوت نییە و لە ژیان زویر بوویت، بینیت ئەو گەنجە پێی نەبوو، بەڵام دڵخۆش بوو و لە ژیان ڕازی بوو!)

کە گەیشتەوەماڵەوە لێوانلێو بوو لە قەناعەت.

# پرسیار

پرسیارم کرد: چۆن باشتر بژیم؟

دوای کەمێك وەستان وەڵامی دامەوە:

رابردووت بەبێ هیچ خەمێك قبوڵ بکە

و بە متمانەوە کاتی ئێستات بەسەر ببە.

بەبێ ترسیش بۆ ئایندە ئامادە بە.

ئیمانت بپارێزە و ترس بەلاوە نێ.

ژیان سەرسوڕهێنەرە، لەبارێکدا کە بزانی چۆن بژیت.

پرسیم: ئاخر.....،

و بەبێ ئەوەی کە گوێ بە پرسیارەکەم بدات، درێژەی بە قسەکانیدا:

گرنگ ئەوە نییە کە جوان بیت......،

جوانە کە گرنگ بیت! تەنانەت بۆ کەسێکیش سەرکەوتن بەرەوپێشچوونە نەك گەیشتنە خاڵی کۆتایی.

بیرم لە قسەکانی دەکردەوە کە هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەردەوام بوو لە قسەکانی:.....

هەموو رۆژێك سەر لە بەیانی لە ئەفریقا، ئاسکێك لە خەو هەڵدەستێت و بۆ ژیان و پەیداکردنی بژێوی لە بیابان دەلەوەڕێ،

ئاسك دەزانێت کە شێر خێراترە، ئەگینا دەبێتە نێچیری شێر.

شێریش بۆ ژیان و بەدەستهێنانی بژێوی لە بیاباندا دەگەڕێ، دەشزانێ لە ئاسك خێراتر رادەکات، تاوەکو بە برسێتی نەمێنێتەوە.

گرنگ نییە تۆ شێر بیت یان ئاسك.... گرنگ ئەوەیە کە لەگەڵ هەڵاتنی خۆر لە خەو هەڵسیت و بۆ بەسەربردنی ژیان بە هەموو توانای خۆتەوە دەست بکەیت بە راکردن....

بە باشی وەڵامی پرسیارەکەی دابوومەوە بەڵام دەمویست دیسان بەردەوام بێت پاشان گرژییەکەی دەم و چاوی نەما و بە نیگایەکەوە وتی:

(رۆشن بە....رۆشن بە...)

فەرق ناکات چ ئەوەی گۆماوێکی بچوك بیت، یان دەریایەکی بێ سنوور، کە رۆشن بوویت ئاسمان لە تۆدایە.

# چیرۆکی گۆڕان

لە سەردەمانی کۆندا کەسێك پەیدا بوو کە بانگەشەی شاهەنشاهی دەکرد بەسەر وڵاتێکی فراواندا. ئەو دوای چەندەها مانگ لە شەڕ و سەرکەوتن بەسەر رکابەرە سەرسەختەکانیدا، توانی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشێت. ماوەیەکی زۆر بوو لە وڵاتەکەدا کێشمەکێشی دەسەڵات هەبوو و جڵەوی کاروبارەکان لە دەست هەمووان دەرچووبوو و کاربەدەستان و وەزیران لە کاروباری وڵات بێ ئاگا ببوون. بۆیە پاشای نوێ پاش جێگیرکردنی دەسەڵات و رەواندنەوەی هەڕەشە دەرەکییەکان و رزگاربوون لە پێشێلکارییەکانی ناوخۆ، بیری ئەوەی بە مێشکدا هات کە سەفەری ناوچە دووردەستەکان بکات و لە نزیکەوە ئاگاداری کێشەکانی خەڵك بێت.

لە یەکەمین سەفەردا، پاشا بۆ دیداری خەڵکی ناوچەیەکی تا رادەیەك بەرفراوانی وڵات، ناچار بوو بەشێك لە سەفەرەکەی بە پێ بڕوات، بۆیە لەکاتی گەڕانەوە بۆ وڵات، لەپای ئەو زەحمەتەی لەو سەفەرە کێشابووی دەستیکرد بە سکاڵا، چونکە بەهۆی بەرداوی بوونی بەشێکی زۆری رێگاکان، پێیەکانی پاشا ئاوسابوون.

ئەو پاش گەڕانەوە، ماوەیەکی زۆر لەمبارەیەوە بیری کردەوە و سەرەنجام رێگەچارەیەکی بە مێشکدا هات. دەستبەجێ وەزیری گواستنەوەی بانگ کرد و فرمانی پێکرد کە: (خەڵکی ئێمە کێشەی زۆریان هەیە کە گرنگترینیان رێگاکانی پەیوەندیکردنە. هەر ئێستا دەچیت رێوشوێنێك دەگریتە بەر بۆ داپۆشکردنی هەموو رێگا بەرداوییەکانی وڵات و رووپێوی ئەنجام دەدەیت تا لە ئایندەی نزیکدا هەمووی

به چەرمی مانگا داپۆشین. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی لە ناخۆشی سەفەر ڕزگاریان بێت و بە ئاسانی بتووانن بەرەو دوورترین شوێنەکانی وڵات ڕێگا ببڕن).

وەزیری گواستنەوەش کە بەردەوام لە دڵەوە گوێی لە فەرمایشتەکانی پاشا دەگرت، دەستبەجێ فەرمانی شاهانەی بە یاریدەدەرانی خۆی گەیاند و فەرمانی پاشا لە هەموو فەرمانگەکانی سەر بە وەزارەتدا بڵاو بووەوە.بە پێی فەرمانی بەرپرسانی خۆجێیی، پۆستەر و لافیتەی پڕوپاگەندەی زۆر لە دەروازە گشتییەکانی شاردا هەڵواسران تاوەکو خەڵکیش لە هەستی بەرپرسیارێتی پاشا بەئاگا بن. لەم میانەدا، خزمەتکارێکی هۆشمەند کە لە کۆشکدا کاری دەکرد، بڕیارەکەی پاشای کەمێك هەڵسەنگاند و لەگەڵ پێوەرە ئەقڵانییەکاندا بە ناکۆکی بینی. ڕۆژێکیان کە لەلای پاشا بوو، کەمێك خۆی هێنا و برد تاوەکو دەرفەتێکی گونجاو بۆ دەربڕینی بۆچوونی خۆی بقۆزێتەوە. دواجار دەرفەتەکە گەیشت و خزمەتکارەکە ئازایەتی هێنایە بەر خۆی و ڕوویکردە پاشا و وتی: (قوربان قسەیەکمان هەبوو ئەگەر ئاسایی بێت! ئەزانیت مانگاکانی ئەم وڵاتە بەشی ئەم پرۆژەیە ناکەن و جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە پێویستی بە واریداتی ملیۆنەها پێستی مانگا هەیە کە وێڕای قورسکردنی خەرجییە زۆرەکانی بودجەی وڵات، لە ئایندەدا شوێنەواری زیانبەخشی وەکو کەمی مانگا و بەرهەمی گۆشت و شیرەمەنی دەبێت. ئایا وا باشتر نییە خاوەنشکۆ لەبری ئەم پرۆژە گەورە و پڕخەرجییە، فەرمان بدەن کە ناوکەفی پێڵاوەکانی هەموو خەڵك بە چەرمی مانگا ناوپۆش بکرێن)!

ئەنجام:

لەبری گۆڕینی جیهان، وا باشترە خۆمان و لەوەش باشتر، دڵمان بگۆڕین.

# عوبەید زاکانی

لە خەوما قیامەت بەرپا ببوو. هەموو قەومێکیان خستبووە ناو چاڵێکەوە و سەری چاڵەکەیان بە پاسەوانانی گورز بەدەست دەورە دابوو، جگە لە چاڵی ئێرانییەکان.

خۆم گەیاندە عوبەید زاکانی و پرسیم: عوبەید ئەمە چ نیشانە و رازێکی لە پشتە کە متمانەیان بە ئێمە ئێرانی کردووە و پاسەوانیان بۆ دانەناوین؟)

وتی: (دەزانن کە ئەوەدە سەرقاڵی خۆمان دەبین کە نازانین لە چاڵداین یان لە بیر). ویستم لێی بپرسم: (ئەگەر لەناوماندا کەسێك بزانێ و بیەوێ بچێتە دەرەوە....) قسەکەی پێ بریم و وتی: (ئەگەر کەسێك لە ئێمە فیلەکەی بیری هیندستان بکات، هەر کام لە ئێمە باشتر لە پاسەوانەکە لەقەیەکی لێ بدەین و فرێی بدەینەوە ناو چاڵەکە).

# نالّی خهراپ

پێش چهند سهدهیهك لهنێوان دوو قهومدا، شهڕێکی سهخت و چارهنووسساز ههلّایسا. ئهم جهنگه چارهنوۆسی خهلّکی بهرگریکار و خاکهکهیانی روون دهکردهوه. ئهوان بهختێکی زۆریان بۆ سهرکهوتن ههبوو، چونکه سوپایهکی رێکخراو و ئامادهکراویان ههبوو. رۆژی شهڕهکه هات. پاشا ئازایهکهی ولّاته بهرگریکارهکه لهگهلّ سوپاکهیدا ههلّیکوتایه ناو جهرگهی هێزهکانی دوژمن و پاشهکشهی پێکردن. بهلّام لهناکاو، پێی ئهسپی پاشا سوڕا و پاشاکهی بهردایهوه سهر زهوی. سهربازانی بهرگریکار که زۆر ترسابوون رایانکرد و له جهنگهکهدا شکستیان خوارد. پاشای هێرشبهر که لهبهرانبهر ئهو سهرکهوتنه شیرینهدا زۆر دلّخۆش بوو، ههولّیدا له هۆکاری سهرکهوتنهکهی خۆی تێبگات. ئهوهبوو له کاتی تاووتوێکردنی ئهسپی پاشادا بۆیان دهرکهوت که نالّی یهکێك له پێیهکانی ئهسپهکه باش نهکوترابوو و لهئهنجامی ساتمهکردن لهسهر کۆسپێك پاشای بهردابووهوه.

ئهنجام:

هێزی خۆگریی زنجیرێك، تهنیا به ئهندازهی لاوازترین ئهلّقهیه. تۆ دهتووانیت له ڕووداوێکی گرنگ و چارهنووسسازدا، تهنیا بههۆی خالّێکی لاوازی ناچیزه و یان جولّهیهك لاواز بدۆڕێیت.

## نیگەرانی هەبوونی کاری باش

لە بەرنامەیەکی رادیۆییدا گفتوگۆ لەگەڵ رێبەرێکی ئۆرکێسترادا دەکرا بەناوی (ئاندرێ پەرڤین). بێژەرەکە لێی پرسی: (بۆچی رێك لەو کاتەدا کە بە گوڕوتین و شارەزایەتییەوە ئیشت دەکرد و دنیات لەژێر پێ نابوو، وازت لە هۆلیوود و کاری بەرهەمهێنانی مۆسیقای فیلم هێنا؟)

(پەرڤین وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: چونکە پەیتا پەیتا گەیشتبوومە ئاستێك کە لەکاتی هەڵسان لەخەو تووشی دڵەخورپە نەدەبووم و چیتر دەربارەی تواناکانم نادڵنیا نەبووم).

سەرنج:

پێویستە هەمیشە سۆراخی باشتربوون بین لە ژیاندا و بەرەو بەرزاییەکان سەرکەوین، نەك ئەوەی کە لە شەقامێکی رێك و پاندا، بەبێ هیچ مەترسییەك، برۆین.

# دوو زانــــا

سەردەمانێك لە شاری دێرینی (ئفکار)دا دوو زانا دەژیان کە پێکەوە بوون و گاڵتەیان بە زانیارییەکانی یەکتری دەکرد. یەکێکیان نکوڵی لە بوونی خوداکان دەکرد و ئەویتریان بڕوای بە هەبوونی خوداکان هەبوو. ڕۆژێکیان ئەو دوو پیاوە یەکتریان لە بازاڕ بینی و لەناو شوێنکەوتووانی خۆیاندا لەبارەی هەبوون یان نەبوونی خودایان کەوتنە مشتومڕ. پاش چەند سەعاتێك مشتومڕ لە یەکتری دوور کەوتنەوە. ئەو شەوە نکوڵیکەری خودایان چووە پەرستگا و لەبەردەم میحرابدا کەوتە کڕنوش بردن و داوای لە خوداکان کرد کە لەبەرانبەر گومڕایی رابردوودا بیبەخشن. هەر لەو کاتەدا زاناکەی تر کە بڕوای بە خوداکان هەبوو، کتێبە پیرۆزەکانی خۆی سووتاند، چونکە باوەڕی خۆی لەدەستدابوو.

## میهرەبانییەکانی حەق

دەگێڕنەوە لە یەکێك جەنگەکانی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ موشریکەکاندا، منالێك بە دیل گیرا. ئەویان لە شوێنێکدا بەند کرد تا ئەو کاتەی کە چارەنووسی دیلەکان دیاری دەکرێت.

لەو شوێنەی کە بەندییەکانیان کۆ کردبووەوە زۆر گەرم بوو و خۆرەتاوێکی سوتێنەر لێی ئەدان.

ژنێك لە خێمەدا، چاوی بە منالەکە کەوت، بەپەلە رایکرد و خەڵکی ناو خێمەکە بەدوایدا رایانکرد، منالەکەی توند گرتە باوەش و خۆی بەسەریدا چەماندەوە تا سێبەری بۆ دروست بکات.

ژنەکە دەگریا و دڵنەوایی منالەکەی دەکرد و دەیگوت: (ئەم منالە منالی منە).

ئەو خەڵکانەی کە دیمەنەکەیان بینی، دەستیانکرد بە گریان و وازیان لە هەموو کارەکان هێنا. بەزەیی سەرسورهێنی دایك، هەمووانی سەرسام کردبوو. پاشان پێغەمبەر (د.خ) هات و مەسەلەکەیان تێگەیاند. ئەو دڵخۆش بوو بە میهرەبانی و گریانی موسڵمانان و پاشان وتی: (سەیرە کە بەزەییتان بەرانبەر ئەو کوڕە جولا؟)

وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا!

وتی: (خودای مەزن لەبەرانبەر هەمووان بەبەزەییترە بە بەراورد بە بەزەیی ئەو ژنە بەرانبەر کوڕەکەی خۆی).

# تێڕوانینی پۆزەتیڤ

ڕۆژێکیان ژنێك لە خەو هەڵدەستێت، سەیری ئاوێنە دەکات و بۆی دەردەکەوێت کە تەنیا سێ تاڵ مووی ڕەش لە قژیدا ماوە. لەبەر خۆیەوە وتی: پێم وایە وا باشە کە ئەمڕۆ قژەکان بهۆنمەوە!! وا دەکات و ڕۆژەکە بە خۆشی بەسەر دەبات. ڕۆژی دواتر لە خەو هەڵدەستێت و لە ئاوێنەکەدا سەیرێکی خۆی دەکات و ئەبینێ تەنیا دوو تاڵ مووی ڕەش لە قژیدا ماوە و لەبەر خۆیەوە دەڵێت: ئەمڕۆ قژم لەناوەڕاستەوە قاش دەکەم، وا دەکات و ڕۆژەکە بە خۆشی بەسەر دەبات. ڕۆژی دواتر لە خەو هەڵدەستێت و لە ئاوێنەکەدا سەیرێکی خۆی دەکات و ئەبینێ تاڵەمویەکی ڕەش لەناو قژیدا ماوە، لەبەر خۆیەوە دەڵێت: ئەمڕۆ قژەکانم لە پشت سەرم ئەبەستم، وا دەکات و ڕۆژەکە بە خۆشی بەسەر دەبات. ڕۆژی دواتر لە خەو هەڵدەستێت و لەئاوێنەکەدا سەیری خۆی دەکات، ئەبینێ تاکە مویەکی ڕەش لە قژیدا نەماوە. لەبەر خۆیەوە دەڵێت: ئەمڕۆکە ناچار نیم قژم ئارایشت بکەم.

# تێڕوانینی تاکەکان بۆ پرسەکان

لە کەسێك دەپرسن: دەزانی بۆچی غەواسەکان لە پشتەوە ڕا خۆیان هەڵدەدەنە ناو ئاو؟

دەڵێت ئاخر ئەگەر لە پێشەوەڕا خۆیان هەڵدەن دەکەونە ناو بەلەمەکەوە ! !

ڕوونکردنـــەوە: بۆچـــوونی جیـــاواز و شـــێوازی بیرکردنـــەوەی جیـــاواز لـــەبارەی پرســـەکانەوە هـــەن. دڵنیـــا بـــن لـــەوەی بیســـەرەکە بـــە باشـــی لـــە مەبەســـتەکەتان تێگەیشتبێت.

# پیاوە دەوڵەمەندەکە و کرێکارەکانی

پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند و پارەدار هەبوو. ڕۆژێکیان پێویستی بە کرێکار بوو بۆ ئیشکردن لەناو باخەکەیدا. بۆیە خزمەتکارەکەی نارده گۆڕەپانی شار تاوەکو چەند کرێکارێك بۆ ئیشکردن بەکرێ بهێنێت.

...خزمەتکارەکە ڕۆیشت و هەموو کرێکارانی ناو گۆڕەپانی شاری بەکرێ گرت و هێنای و ئەوان لەناو باخەکەدا سەرقاڵی کارکردن بوون. ئەو کرێکارانەی کە ئەو ڕۆژە لە گۆڕەپانەکە نەبوون، گوێبیستی ئەم بابەتە بوون و ئەوانیش هاتن.

ڕۆژی دواتر و ڕۆژەکانی تریش ژمارەیەکی تری کرێکار هاتن. ئەگەرچی ئەم کرێکارە تازانە سەروەختی خۆرئاوابوون گەیشتن، بەڵام پیاوە دەوڵەمەندەکە ئەوانیشی خستەکار. سەروەختی تاریك داهاتن، ئەو کاتەی کە خۆر ئاوا ببوو، ئەو هەموو کرێکارەکانی کۆ کردەوە و کرێیەکی یەکسانی دایە هەمووان.

گومانی تیا نییە کە ئەوانەی لە بەرەبەیانەوە سەرقاڵی کارکردن بوون نارەحەت بوون و وتیان: (ئەمە بێ ویژدانییە. ئەوە چی ئەکەیت قوربان؟ ئێمە لە بەیانییەوە کارمان کردووە و ئەوان لە سەروەختی خۆرئاوابووندا گەیشتوون و دوو سەعات زیاتر نییە کە ئیش دەکەن. تەنانەت هەندێکیان چەند خولەکێکە هاتوونەتە لامان. ئەمانە هەر هیچیان نەکردووە).

پیاوە دەوڵەمەندەکە پێکەنی و وتی: (حەقی ئەوانیترتان نەبێ. ئەرێ ئەوەی من داومەتە ئێوە کەم بووە؟)

کرێکارەکان تێکڕا وتیان: (نەخێر. ئەوەی کە تۆ بە ئێمەت داوە، زیاتریش بووە لەو کرێیەی کە ئەماندەیتێ. لەگەڵ ئەوەشدا دادپەروەرانە نییە ئەوانەی کە درەنگ گەیشتوون و هیچیان نەکردووە، هەمان ئەو کرێیە وەربگرن کە ئێمە وەرمانگرتووە). پیاوە دەوڵەمەندەکە وتی: (من ئەو پارەیەم داوەتە ئەوان چونکە زۆرم هەیە. من ئەگەر چەندقاتی ئەوەش بدەم، هیچ لە سامانەکەم کەم نابێتەوە. من لە سامانی خۆم پارە ئەدەم. ئێوە نیگەرانی ئەم بابەتە مەبن. ئێوە زیاتر لە چاوەڕوانی خۆتان کرێتان وەرگرتووە، کەوتە بەراوردکاری مەکەن. من لەبەرانبەر کارەکەیان کرێیان نادەمێ، بەڵکو لەبەر ئەوە دەیاندەمێ کە زۆرم هەیە بۆ بەخشین. من لە رووی بێ نیازییەوەیە کە پارە ئەبەخشمەوە).

مەسیح وتی: (هەندێ کەس بۆ گەیشتن بە خودا سەرسەختانە هەوڵ دەدەن. هەندێك کەس رێك لە خۆرئاوابووندا دەگەن. هەندێکیش کاتێك کە ئیش تەواو بووە پەیدا دەبن. بەڵام هەمووان بە یەکسانی دەکەونە ژێر سێبەری خوداوەندەوە).

تۆ دەزانیت کە خودا ناڕوانێتە شایستەیی بەندەکانی، بەڵکو دەڕوانێتە سامانی خۆی، نەك کاری ئێمە. لە سامانی خودا جگە لە بەهەشت هیچی تر ناپشکوێت. هەردەبێ وەهاش بێت. بەهەشت، دەرکەوتەی بێ نیازی و سامانی خوداوەندە. هەر ئەم وشکە قەدیس و بەرچاوتەنگانە دۆزەخیان بەرپا کردووە. چونکە ئەمانە ئەوەندە بەخیل و پڕ ئیرەیین کە ناتوانن جگە لە خۆیان چاکەی خودایی بە کەس رەوا ببینن.

# هاوسەفەری حەج

پیاوێك لە سەفەری حەج دەگەڕێتەوە و بەسەرهاتی سەفەرەکەی خۆی و هاوڕێکانی بۆ ئیمامی سادق دەگێڕێتەوە. بەتایبەت زۆر ستایشی یەکێك لە هاوسەفەرانی خۆی کرد کە دەیگوت کابرایەکی زۆر گەورە بوو و ئێمە زۆر مایەی شانازیمان بووە کە پیاوێك شەریفی وەهامان لەگەڵدا بووە، یەکلایەنە خەریکی تاعەت و عیبادەت بوو. هەر کە لە ماڵێك گیرسواینەوە، ئەو یەکسەر دەچووە گۆشەیەك و بەرماڵەکەی پان دەکردەوە و دەکەوتە نوێژ و نزاکردن. ئیمامی سادق پرسیاری کرد: (چ کەسێك کارەکانی ئەوی ئەنجام دەدا و چ کەسێك ئاژەڵەکەی ئەوی تیمار دەکرد؟)

پیاوەکە وتی: (هەڵبەت ئێمە شانازیی ئەم کارەمان ئەگرتە ئەستۆ و ئەو تەنیا خەریکی کارە پیرۆزەکانی خۆی بوو و لای ئەم کارانەی نەدەکردەوە.

ئیمام لە وەڵامدا وتی: کەوایە هەمووتان لەو باڵاتر بوون.

## میهرەبان بە

خەڵکی زۆرجار بێ ویژدان، بێ لۆژیك و خۆپەرستن، بەڵام لێیان خۆشبە.

ئەگەر میهرەبان بیت بەوە تۆمەتبارت دەکەن کە ئەنگێزەی شاراوەت هەیە، بەڵام میهرەبان بە.

ئەگەر سەرکەوتوو بیت هاوڕێیانی ساختە و دوژمنانی راستەقینە ئەدۆزیتەوە، بەڵام سەرکەوتوو بە.

ئەگەر سەرڕاست و کارچاك بیت فریوت ئەدەن، بەڵام سەرڕاست و کارچاك بە.

دەشێ ئەوەی کە بە درێژایی ساڵانێك بونیادت ناوە لە شەوێك نابوت بکەن، بەڵام بونیادنەر بە.

ئەگەر دەستت بە شادمانی و ئارامی بگات ئیرەییت پێ دەبەن، بەڵام شادمان بە.

باشییەکانی ناوەوەت فەرامۆش دەکەن، بەڵام چاکەکار بە.

باشترین شتەکانی خۆت بە دنیا ببەخشە ئەگەر هیچ کاتێك بەس نەبێت.

لە کۆتاییدا ئەبینیت کە هەرچییەك هەیە هەمیشە لەنێوان (تۆو خوداوەند)دایە نەك لەنێوان تۆ و خەڵکدا.

## هـــهســت

کوڕێکی گەنج پاش ماوەیەکی زۆر لە ماڵ چووە دەرەوە. نەخۆشی دەروونی پەکی خستبوو. ئێستا ئیتر بەهۆی پێداگریی دایکییەوە هاتبووە سەر شەقام. لە چەند فرۆشگایەك تێپەڕی. جامخانەی فرۆشگایەکی گەورە سەرنجی ڕاکێشا و چووە ناوەوە. لە بەشێکی فرۆشگاکەدا کە تایبەت بوو بە مۆسیقا چاوی بە کچێکی گەنج کەوت کە فرۆشیاری ئەو بەشە بوو. فرۆشیارەکە، کچێکی هاوتەمەنی خۆی بوو خەندەیەکی جوانی لەسەر لێوان بوو. خەندەی ئەو کچە لە تێڕوانینی ئەودا جوانترین شت بوو کە لە هەموو تەمەنیدا بینیبووی! کچەکە سەیرێکی کرد و وتی:

—ئەتووانم یارمەتیتان بدەم؟

بە یەك نیگا ئارەزوومەندییەکی لە بەرانبەر ئەودا پەیدا کرد بەڵام هیچ کاردانەوەیەکی لە خۆی پیشان نەدا. تەنیا وتی:

—من لەوحەیەکی مۆسیقام ئەوێت.

یەکێکیانی هەڵبژارد و دایە دەست کچەکە. کچەکەش لەوحەکەی وەرگرت و هەر بەو بزەیەوە وتی:

—حەز دەکەیت بۆت بپێچمەوە؟

و بێ ئەوەی کە چاوەڕوانی وەڵام بێت، چووە پشت جامخانەکە و چەند ساتێك دواتر پاکەتە پێچراوەکەی دایە دەست کوڕەکە. کوڕە گەنجەکەش بە پاکەتە پێچراوەکەوە چووە ماڵەوە و لەو ڕۆژە بەدوا هەموو ڕۆژێك دەچووە فرۆشگا و لەوحێکی دەکڕی و کچەکەش لەوحەکەی دەپێچایەوە دەیدایە دەستی.

کوڕەکە چەندەها جار ویستی حەزی بۆ فرۆشیارەکە دەربېڕێت بەڵام نەیتووانی. دایکی کە ئاگاداری گۆڕانکاریی ڕەفتاری کوڕەکە ببوو، لە هۆکاری ئەم شپرزەییەی پرسی و کاتێك بەوەی زانی کە حەزێکی لەبەرانبەر ئەودا تیا پەیدا بووە، پێشنیاری ئەوەی کرد کە ئەم بابەتە بە کچەکە بگەیەنێت و ڕەئی وەربگرێت. بەڵام قبوڵی نەکرد.

ئەو هەر جارێك کە دەیویست لەگەڵ کچەکەدا قسە بکات نەیدەتووانی و تەنیا لەوحەیەکی دەکڕی و دەچووە دەرەوە.

نەخۆشیی گەنجەکە پەیتا پەیتا توندتر دەبوو و ئەو نەیدەتووانی حەزی خۆی بۆ کچەکە دەربېڕێت. ڕۆژێکیان چووە فرۆشگاکە، تەنیا ژمارەی تەلەفۆنەکەی لەسەر کاغەزەکە نووسی و لە پەنجەرەکەیدا و ڕۆیشت! ئیتر ڕۆژی دواتر نەچووەوە بۆ فرۆشگاکە!

چەند ڕۆژێك تێپەڕی و کچەکە لە نەهاتنەوەی کوڕەکە سەری سوڕما و ژمارە تەلەفۆنەکەی هاتەوە یاد و پەیوەندی بە ماڵەوەیان کرد، دایکی کوڕەکە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و کاتێك زانی ئەو هەر ئەو کچە فرۆشیارەیە، دەم بە گریانەوە وتی:

—تۆ درەنگ تەلەفۆنت کرد...!! کوڕەکەم پێش دوو ڕۆژ کۆچی دوایی کرد.

کچەکە زۆر شپرزە بوو و ناونیشانی لە دایکەکە وەرگرت تاوەکو بیبینێت. کاتێك گەیشتە ماڵی کوڕەکە، تکای لە دایکەکە کرد کە ژووری کوڕەکەیان ببینێت. لە ژوورەکەدا، کوڕەکە تەپۆلکەیەك لە لەوحە مۆسیقییەکانی کۆ کردبووەوە کە هەڵنەپچڕیبوون!!

دایکەکە یەکێك لە پێچراوەکانی کردەوە و بە سەرسوڕمانەوە یادداشتێکی لەناویدا بینی کە لێی نوسیبوو (تۆ کوڕێکی بە ئەدەب و خاوەن کەسایەتیت و ئەگەر حەز بکەیت دەتووانین پێکەوە فنجانێك قاوە بخۆینەوە).

یادداشتەکە لەلایەن کچە فرۆشیارەکەوە بوو. دایکەکە پاکەتەکەی دواتری کردەوە و دیسان هەمان یادداشتی تێدا بوو!

دایکەکە وتی: کوڕم پێم وتبووی کە ئەگەر بە راستی حەز دەکەیت هەستەکەت دەربڕە و لێگەڕێ ئەویش بزانێت کە هەستت بەرانبەری هەیە. لەوانەیە ئەویش حەزی بە تۆ بێت و چاوەڕوانت بێت.

## مشك و هاوڕێیان بێباك

مشکێك له ماڵه‌که‌دا ته‌ڵه‌مشکێکی بینی. هه‌واڵه‌که‌ی به‌ مریشك و مانگا و مه‌ڕ گه‌یاند. هه‌موویان وتیان: ته‌ڵه‌ی مشك کێشه‌ی تۆیه‌ و په‌یوه‌ندی به‌ ئێمه‌وه‌ نییه‌.

چه‌ند رۆژێك دواتر، مارێك که‌وته‌ ناو ته‌ڵه‌که‌وه‌ و گازی له‌ ژنی ماڵه‌که‌ گرت که‌ چووبووه‌ سۆراخی، له‌ ماڵه‌که‌یدا سوپی مریشکیان بۆ دروستکرد، مه‌ڕیان بۆ سه‌ردانکه‌رانی سه‌ربڕی. مانگایان بۆ مه‌راسیمی پرسه‌که‌ کوشته‌وه‌ و هه‌موو ئه‌و ماوه‌یه‌ مشك له‌ کونی دیواره‌که‌وه‌ ته‌ماشای ده‌کرد.

مه‌ولانا ده‌ڵێت:

له‌ جیهاندا ته‌نیا یه‌ك فه‌زیڵه‌ت هه‌یه‌ و ئه‌ویش (ئاگایی)یه‌ و ته‌نیا یه‌ك گوناه بوونی هه‌یه‌ و ئه‌ویش (جه‌هل)ه‌.

# دیاری

پیاوێکی گەنج دوایین رۆژەکانی زانکۆی بەسەر دەبرد و بەزوویی تەخەروجی دەکرد. چەند مانگێك بوو کە ئۆتۆمبێلێکی سپۆرتی جوان سەرنجی راکێشابوو. لەبەرئەوەی دەیزانی باوکی بە ئاسانی دەتووانێت ئەو ئۆتۆمبێلە بکڕێ، پێی وت هەبوونی ئەو ئۆتۆمبێلە تاکە ئاواتیەتی. لەگەڵ نزیکبوونەوەی رۆژی تەخەروج، پیاوە گەنجەکە بە بەردەوامی سۆراخی نیشانەگەلێکی کڕینی ئۆتۆمبێلەکەی دەکرد. دواجار لە بەرەبەیانی رۆژی دەرچووونیدا، باوکی بانگی کردە ژوورەکەی خۆی و پێی وت زۆر شانازی دەکات کە کوڕێکی وەهای هەیە و زۆر خۆشی دەوێت. پاشان ئەو دیارییەی دایە کە زۆر جوان پێچابوویەوە. پیاوە گەنجەکە هەڵبەت بە جۆرێك هەستی نائومێدییەوە دیارییەکەی کردەوە کە ئینجیلێکی بەرگ چەرمی دڵگیر بوو. لەگەڵ بینینی دیارییەکە، پیاوە گەنجەکە پەست بوو، دەنگی بەرز کردەوە و بە توڕەییەوە وتی: (بەو هەموو پارەیەوە کە هەتە تەنیا ئینجیلێکم بۆ دەکڕیت؟) و وەکو گەردەلوولێکی توند ماڵەوەی جێهێشت ئینجیلی پیرۆزی لەوێ جێهێشت. ساڵانێکی زۆر تێپەڕین و پیاوە گەنجەکە سەرکەوتنی زۆر گەورەی لە بازرگانیدا بەدەستهێنا.

هەر لەو ساڵەدا تەلەگرامێکی بەدەست گەیشت کە تیایدا هاتبوو کە باوکی مردووە و هەموو سامانی خۆی بۆ ئەو جێهێشتووە و دەبێ هەرچی زووە بگەڕێتەوە ماڵی باوکی و ئیشەکان رایی بکات.

ئەو باوکی لە بەرەبەیانی پاش رۆژی دەرچوونییەوە نەبینیبوو. کاتێك گەیشتەوە ماڵی باوکی، لەپڕ خەم و نیگەرانی دایگرت. پرژایە سەر تەماشاکردنی کاغەزەکانی باوکی و ئینجیلێکی بەرچاو کەوت کە پێش ساڵانێك لەوێ جێی هێشت و هەڵینەگرت. لەکاتێکدا کە فرمێسك لە چاوانی دەهاتە خوار، کتێبە پیرۆزەکەی کردەوە و لاپەڕەکانی هەڵدایەوە. لەکاتێکدا کە خەریکی دێڕەکانی بوو لەپڕ سویچێك کە لەناو لایەکی کتێبەکەدا بوو بەر بووەوە سەر زەوی کە لەناو وەسڵ و گرێبەستی کڕینەکەدا وەرپێچرابوو.

(تاوەکو ئێستا چەند جار خۆمان لە نیعمەتەکانی خوداوەند بێبەش کردووە! تەنیا لەبەرئەوەی کە بەو شێوەیە نەبووە کە چاوەڕوانمان کردووە).

## بەهای موعجیزە

سارا هەشت ساڵان بوو کە لە گفتوگۆکانی باوك و دایکییەوە تێگەیشت کە برا بچوکەکەی زۆر نەخۆش و پارەشی بۆ چارەسەرکردنی نییە.

باوکەکە تازە کارەکەی لەدەستدابوو و نەیدەتوانی خەرجیی نەشتەرگەریی پڕ خەرجی براکەی بدات.

سارا گوێی لێبوو باوکی بە هێمنی بە دایکی دەڵێت، تەنیا موعجیزە دەتوانێت کوڕەکەمان رزگار بکات. سارا بە نارەحەتییەوە چووە ژوورەکەی و دەغیلە بچوکەکەی دەرهێنا و شکاندی.

پاشان بە هێمنی لە دەرگای دەرەوەڕا چووە دەرەوە و چەند کۆڵانێك لە سەرووتر چووە دەرمانخانەیەك.

لەوێ لەبەردەم مێزەکە چاوەڕوان بوو تا دەرمانسازەکە سەیری بکات بەڵام دەرمانسازەکە سەرگەرمی کڕیارەکانی بوو. سەرەنجام سارا ئارامی نەما و پارەکانی بە توندی لەسەر مێزەکە هەڵڕشت.

دەرمانسازەکە تووشی شۆك بوو و وتی چیت دەوێ؟

کیژۆڵەکە لە وەڵامدا وتی: براکەم زۆر نەخۆشە، دەمەوێ موعجیزە بکڕم بایی چەندە؟

دەرمانسازەکە بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی: وتت چیت ئەوێ!!؟

کیژۆڵەکە وتی: برا بچوکەکەم شتێك چووەتە ناو سەریەوە و باوکم دەڵێت تەنیا موعجیزە دەتووانێ چاکی بکاتەوە، منیش دەمەوێ موعجیزە بکڕم، بایی چەندە؟

دەرمانسازەکە وتی: بەداخم کچی باش بەڵام ئێمە لێرە موعجیزە نافرۆشین.

چاوەکانی کیژۆڵە پڕبوون لە فرمێسك و وتی تخوا، براکەم زۆر نەخۆشە و باوکم پارەی نییە و ئەمە پارەی منە. من لە کوێوە بتووانم موعجیزە بکڕم؟؟

پیاوێك کە لە گۆشەیەکدا وەستابوو و جلێکی پاك و تەمیزی لەبەردا بوو لە کچەکەی پرسی:

چەنێك پارەت هەیە؟

کچەکە پارەکەی خستە ناو دەستیەوە و پیشانی کابرایدا. پیاوەکە بزەیەکی هات و وتی: ئاه چەند باشە!!

پێم وایە ئەو پارەیە بۆ کڕینی موعجیزە بەس بێت. پاشان بە هێمنی دەستی گرت و وتی دەمەوێ براکەت و دایك و باوکت ببینم.

پێم وایە موعجیزەی براکەت لای منە. ئەو پیاوە دکتۆر ئارمسترۆنگی پسپۆڕی مێشك و دەمار بوو لە شیکاگۆ.

سبەی ئەو رۆژە، نەشتەگەری مێشکی کوڕەکە بە سەرکەوتووی ئەنجامدرا و لە مەرگ رزگاری بوو. پاش نەشتەرگەری باوکەکە چووە لای دکتۆر و وتی سوپاست دەکەم، رزگاربوونی کوڕەکەم موعجیزەیەکی راستەقینە بوو، دەمەوێ بزانم خەرجیی نەشتەرگەرییەکە چەنێکە و ئەبێ چەند بدەم؟

دکتۆر بزەیەکی هات و وتی: خەرجیی نەشتەرگەرییەکە پێنج دۆلار بوو کە پێشتر واسڵ کراوە.

# بـــــاران

ئەو ڕۆژە یەکێك بوو لە گەرمترین ڕۆژانی وەرزی وشکە ساڵی و تەقریبەن مانگێك بوو کە بارانمان نەبینیبوو، باڵندەکان یەك یەك بەردەبوونەوە و بەرهەمی کشتوکاڵی هەموولن نابوت ببوو، مانگاکان چیتر شیریان نەدەدا، ڕووبارەکان و جۆگەلەکان هەموویان وشك ببوون و هەر ئەم وشکەساڵییە ببووە هۆی مایەپوچی زۆرێك لە کشتیاران. هەموو ڕۆژێك مێردەکەم لەگەڵ براکانی بە شێوەیەکی تاقەتپڕوکێنانە ئاویان دەگەیاندە کێڵگەکان، هەڵبەت لەم دواییانەدا تانکەرێکی ئاومان کڕیبوو و هەموو ڕۆژێك لە شوێنی دابەشکردنی ئاو، تێمان دەکرد. ئەگەر زوو باران نەبارییبایە، لەوانەبوو هەموو شتێك لەدەست بدەین و هەر لەو ڕۆژەدا بوو کە وانەیەکی گەورە لە هاریکاری فێر بووین و بە چاوی خۆمان موعجیزەمان بینی.

کاتێك کە لە مەتبەخ خەریکی ئامادەکردنی نانی نیوەڕۆ بووم بۆ مێردەکەم و شوبراکانم، (بیلی)ی کوڕە شەش ساڵانەکەم بینی لەکاتێکدا کە بەرەو دارستان دەڕۆیشت. ئەو ئەوەندەی منالێك ئاسان نەبوو. وەها هەنگاوی هەڵدەهێنا وەك بڵێی ئامانجێکی گرنگی هەیە. من تەنیا لە پشتەوەڕا دەمبینی، بەڵام تەواو دیار بوو کە بە دیقەتێکی زۆرەوە بە ڕێگا دا دەڕوات و هەوڵ دەدات ئەوەندەی بکرێ لا نەکاتەوە. هێشتا چەند خولەکێکی مابوو لە دارستان بزر ببێت کە بە خێرایی بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە. منیش بەو باوەڕەی کە هەر کارێك کە ئەنجامیداوە ئیتر تەواو بووە، گەڕامەوە ناو ماڵەوە تاوەکو لەفەکان دروست بکەم. ساتێك دواتر بە

هەنگاوی لەسەرخۆ و بەئامانجەوە بەرەو دارستان رۆیشت و ئەم کارە سەعاتێکی پێچوو. بە وریاییەوە بەرەو دارستان هەنگاوی دەنا و پاشان بەپەلە بەرەو ماڵەوە رایکرد.

سەرەنجام کاسەی سەبرم لەسەریەوە رژا، لەسەرخۆ لە ماڵ چوومە دەرەوە و سۆراخیم کرد. زۆر بەئاگا بووم کە نەمبینێت، چونکە زۆر روون و ئاشکرا بوو کارێکی گرنگ ئەنجام دەدات و نەمدەویست وا بزانێ کە کۆنترۆڵی دەکەم. دەستەکانیم بینی کە فنجانە ئاوێکیان هەڵگرتووە و لای خۆی دایناوە، زۆر وریا بوو لەوەی کە ئەو ئاوەی لەدەستەکانیدا هەڵیگرتووە نەڕژێت، ئاوێك کە لەوانەیە لە دوو سێ کەوچك زیاتر نەبووبێت. کاتێك دووبارە گەڕایەوە ناو دارستان، لەسەرخۆ لێی نزیك کەوتمەوە، لقەکانی درەختەکان بەر دەم و چاوی دەکەوتن، بەڵام ئامانجەکەی زۆر لەوە گرنگتر بوو کە بیەوێ بڕوات. کاتێك چەمامەوە تاوەکو بزانم چی ئەکات، رووبەڕووی سەرسوڕهێنترین دیمەنی سەرانسەری ژیانم بوومەوە، چەند ئاسکێك لەبەردەمیدا دەرکەوتن، پاشان بیلی بەرەو لایان رۆیشت. حەزم دەکرد هاوار بکەم و لەوێ دەریپەڕێنم. پاشان ئاسکە کێوییەکی گەورەم بینی کە قۆچەکانی زۆر گەورە بوون، بینیم بە شێوەیەکی ترسناك لە بیلی نزیك دەکەوتەوە، بەڵام هیچ زیانێکی پێ نەگەیاند. تەنانەت ئەو کاتەش کە بیلی ئەژنۆی لەسەر سەر زەوی دادا، لە شوێنی خۆی نەجوڵا. بێچووە ئاسکێك لەسەر زەوییەکە کەوتبوو و دیار بوو کە بەهۆی گەرما و کەمبوونەوەی ئاوەوە ئازار دەچێژێت. بێچووە ئاسکەکە بە زەحمەتێکی زۆرەوە سەری هەڵبڕی تاوەکو ئەو ئاوەی کە لە دەستەکانی کوڕەکەمدایە بخواتەوە. کاتێك ئاوەکە تەواو بوو، بیلی هەستایە سەر پێ و بە پەلە بەرەو ماڵ بووەوە، خۆم لە پشت درەختێك شاردەوە تاوەکو نەمبینێت. کاتێك کە بەرەو ماڵەوە و بەرەو ئەو بەلوعەیە دەڕۆیشت کە گرتبووم، بەدوایدا رۆیشتم. بیلی

بەلوعە ئاوەکەی تا دوایین ئاست کردەوە و دڵۆپەکان بەرەبەرە هاتنە خوار و لەوێوە، لەکاتێکدا کە خۆرەتاو لە پشتی ئەدا، کەوتە سەر ئەژنۆکانی و چاوەڕێ بوو تا دڵۆپە ئاوەکان هاتنەخوار و دەستەکانیان پڕ کرد. ئێستا بابەتەکەم بۆ روون بووەوە. بەهۆی شەڕە ئاو بە سۆندە لە هەفتەی رابردوودا و وتاردانێکی چڕوپڕ کە لەبارەی دەستگرتن بە ئاوەوە لە منی بیستبوو، خوازیاری یارمەتی من نەبوو. تەقریبەن بیست خولەکی خایاند تا دەستەکانی پڕ بوون. کاتێك هەستا و ویستی بڕواتەوە بۆ دارستانەکە، من لە بەرانبەریدا وەستابووم. لەکاتێکدا کە چاوە بچوکەکانی پڕ ببوون لە فرمێسك، تەنیا وتی: من ئاوم بەهەدەر نەداوە و لە رۆیشتنەکەی بەردەوام بوو. منیش بە جامێك ئاوەوە کە لە مەتبەخ دامنابوو لەگەڵیدا کەوتمەڕێ. کاتێك کە گەیشتم، لەدواوە وەستام و رێگەمدا بە تەنیا بێچووە ئاسکەکە تێراو بکات، چونکە ئەمە ئیشی ئەو بوو و دەبوایە خۆی تەواوی بکات. من وەستام و سەرقاڵی تەماشاکردنی جوانترین دیمەنی ژیانم بووم، واتە دیمەنی هەوڵ و تەقەلا بۆ رزگارکردنی گیانێکی تر. کاتێك فرمێسك لە چاوم هاتنە خوار، لەناکاو دڵۆپەکان زیاتر و زیاتر بوون. سەیری ئاسمانم کرد، وەك بڵێی ئەمجارە خودا بوو کە بە غرور و شانازییەوە دەگریا. لەوانەیە هەندێ کەس بڵێن ئەمە تەنیا رێکەوت بووە، هەندێ جار دەبێ باران هەر ببارێت. من ناتووانم مشتومڕیان لەگەڵدا بکەم، تەنانەت هەوڵیش نادەم. تاکە شتێك کە دەتووانم بیڵێم، ئەوەیە کە باران کێڵگەکەمانی رزگار کرد. رێك وەکو تەمەنی ئەو منداڵەی کە بووە هۆی رزگارکردنی گیانی بێچووە ئاسکێك!

# کۆتایی هاوڕێیەتی

(چارلی) و (ئانتیمۆ) لەگەڵ ئەوەشدا کە خەڵکی دوو نەتەوەی جیاواز بوون، هاوڕێیەتییەکەیان ئەوەندە بەهێز بوو کە لە زانکۆ بەردەوام لەسەر زاران بوون. بەجۆرێك کە کاتێك ئەنتیمۆ نەیتووانی ٦ نمرە بەدەست بێنێت، (چارلی)یش لە تاقیکردنەوەدا پەڕە کاغەزەکانی بە سپی پێشکەش کرد تاوەکو هاوڕێیەکەی لە کۆتایی ساڵدا بە تەنیا نەبێت.

بەڵام پاش تەخەروج و لەو کاتەوە کە ئانتیمۆ هاوسەرگیری کرد، دووریی کەوتە نێوانیانەوە و هەر ئەمەش بووەهۆی ئەوەی کە چارلی ئالوودە ببێت. هەڵبەت ئانتیمۆ دیسان بە تەنیا جێی نەهێشت و ئەویش وازی لە مادەی هۆشبەر هێنا. بەڵام پاش ماوەیەك چارلی دووبارە دەستیدایەوە تریاك و ...دواجار ئانتیمۆ ڕۆژێکیان توڕە بوو و کاتێك چارلی بۆ سەدەمین جار داوای پارەی لێکرد تاوەکو مادەکە بکڕێت، ئانتیمۆ کۆنە هاوڕێکەی لە ماڵ کردە دەرەوە!

چارلی ماوەیەك ئاوارە بوو...تا ئەوەی کە لەپڕ فریشتەی ڕزگاربوونی لە شێوەی کچێك جوان و دەوڵەمەند بە پیریەوە هات!

چارلی بەجۆرێك عاشقی لیندا بوو کە تووانی واز لە ئالوودەبوونەکەی بێنێت. ئەوەبوو ڕۆژێکیان چارلی لەگەڵ کچە هاوڕێکەی چوونە ماڵی ئانتیمۆ و لەکاتی نانی ئێوارەدا چارلی قسەی دڵی خۆی دەربڕی. من گەمژەترین هاوڕێی ئەم جیهانەم کە ساڵێك تەمەنم لە زانکۆ لەپێناو تۆدا بەهەدەر دا! بەڵام تۆ پارەی وەجبەیەك لە مادەکەت نەدامێ! ئانتیمۆ بزەیەکی ساردی کرد و وتی: نا! من گەمژەترینم کە پارەی مادەکەم بە تۆ نەدا، بەڵام خوشکە جوان و دەوڵەمەندەکەم نارده لات تاوەکو بە عەشقەکەی تۆ لەو پیسییە بێنێتە دەرەوە. پاشان ئانتیمۆ سەری شۆڕ کرد تاوەکو شەرمەندەیی چارلی نەبینێت.

# کرێکار

پیرەژنێك بۆ کاری سپیکاری خانووەکەی، کرێکارێکی گرت. کاتێك کرێکارەکە هاتە ناو ماڵی پیرەژنەکە، مێردە پیر و نابیناکەی بینی و دڵی بەم پیرە ژن و پیرە پیاوە سوتا. بەڵام لەو ماوەیەدا کە لەو ماڵەدا کاری دەکرد بۆی دەرکەوت کە پیرەمێردەکە مرۆڤێکی زۆر شاد و گەشبینە. ئەو هەر لەکاتی کارکردنەکەدا لەگەڵ پیرەمێردەکەدا قسەی دەکرد و پەیتا پەیتا بووە هاورێی. لەم ماوەیەدا هیچ ئاماژەی بە کەمئەندامێتی جەستەی پیرەمێردەکە نەدا.

پاش تەواوبوونی کاری سپیکارییەکە، کاتێك کە کرێکارەکە قائیمەی حسابی دایە هاوسەرەکەی ئەو، پیرەژنەکە بۆی دەرکەوت کە ئەو خەرجییەی تیایدا نوسیوویەتی، زۆر کەمترە لەو برەپارەیەی کە پێش لەسەری رێکەوتبوون. پیرەژنەکە لە کرێکارەکەی پرسی کە بۆچی ئەو هەموو داشکاندنەیان بۆیان کردووە؟ کرێکارەکە لە وەڵامدا وتی: (من کاتێك لەگەڵ مێردەکەتدا قسەم دەکرد زۆر دڵم خۆش دەبوو و لە روانگەکەیەوە بۆ ژیان بۆم دەرکەوت کە بارودۆخەکەی من ئەوەندە خراپ نییە کە بیرم لێ دەکردەوە.

بۆیە گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە کار و ژیانی من ئەوەندەش سەخت نییە. بۆیە داشکاندنم بۆ کردن تا سوپاسی بکەم). پیرەژنەکە لەبەرانبەر پیاهەڵدانی مێردەکەی و دڵگەورەیی کرێکارەکە خۆی بۆ نەگیرا و دەستیکرد بە گریان، چونکە سەیریکرد کرێکارەکە تەنیا یەك دەستی هەیە.

## با له پشت پەردەوە یاریی شاراوە هەبن، خەم مەخۆ

پۆستەچییەکە لە دەرگای ماڵەکەیدا...

کچەکە: کێیە؟

پۆستەچی: سڵاو خاتوون، پۆستەچیم. نامەیەکتان هەیە تکایە وەرنە خوارەوە وەریگرن.

کچەکە: ئێستا دێم.

بە درێژایی رێگاکە کە کچەکە بەرەو دەرگاکە هەنگاوی دەنا، لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە:

ئاخر لەسەردەمی پەیوەندییەکان و ئینتەرنێت و ئێس ئێم ئێس و هەزار ئامرازی تری پەیوەندیکردن کێ نامە دەنێرێت؟

لەکاتێکدا کە هەروا لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد گەیشتە دەرگاکە و کردییەوە.

کچەکە: سڵاو ماندوو نەبیت.

پۆستەچی: سڵاو، فەرموون ئێرە واژۆ بکەن.

کچەکە واژۆی کرد و نامەکەی وەرگرت و پاشان بەرەو لای ژوورەکەی رۆیشت...سەیری پشت زەرفەکەی کرد.

چووە ژوورەوە و دانیشت..لەسەر نامەکە نوسرابوو (زانکۆی ئازادی ئیسلامی، لقی چالوس) نامەکە لە زانکۆی کچەکەوە هاتبوو...نامەکەی کردەوە و پاش خوێندنەوەی نامەکە بەبێ ویست دەستیکرد بە گریان.

ناوەرۆکی نامەکە بەم شێوەیە بوو:

سلاو

خوێندکاری ئازیز، ئاگادارت دەکەینەوە کە تۆ دەچیتە کەمپی سەرگەرمی و گەشتیاری دێهات. تکا دەکەین تاوەکو ئەو بەروارەی دیاریکراوە پەیوەندی بکە بە ئۆفیسی زانکۆ و فۆرمی خۆت وەربگرە.

کچەکە هەر دەگریا...

ئەو بەروارەی کە لەنامەکەدا نوسرابوو هەر ئەو بەروارەی بوو...سێ مانگ لەوەوبەر بوو. کچەکە پێش سێ مانگ بۆ ئەم کامپە بانگهێشتکرابوو بەلام نامەکە ئێستا بەدەستی گەیشتبوو. بۆ حالی هاورێکانی گریانی دەهات. ئەو پاسە هەر ئەو رۆژە هەلدێرابوو و هەموو کچەکان مردبوون...

کچەکە لەکاتێکدا کە هەر دەگریا سەری بەرز کردەوە و وتی:

(خودایە تۆ هەموو بەندەکانت خۆش دەوێت و بۆ هەموویان بزە ئەخەیت سەر لێو. ئەمە دەستپێکێکی تازەیە کە تۆ بە منت بەخشیووە. هیچ کاتێك ئەم دیارییە بەنرخەی کە بە منت بەخشیووە فەرامۆش ناکەم).

## دنیای بێ کردار

لە کافێی فرۆکەخانەکەدا کەسێکی لێ بوو کە جگەرە لەدوای جگەرەی دەکێشا. کەسێک هات و لەبەردەمیەوە دانیشت و پێی وت:
ببوورە بەڕێز! تۆ رۆژی چەند جگەرە دەکێشیت؟
-مەبەستت؟
-مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر پارەی ئەم جگەرەیەت کۆ بکردایەتەوە، سەرباری ئەو پارەیەی کە بەهۆی ئەم بێ دینەوە، لە دەرمان و دکتۆری ئەدەیت، ئێستا ئەو فڕۆکەیەی کە لەوێیە هی تۆ بوو!
-تۆ جگەرە ئەکێشیت؟
-نەخێر!
....فڕۆکەت هەیە؟
-نەخێر!
-بەهەرحاڵ سوپاس بۆ ئامۆژگارییەکەت، بۆ زانیاریت ئەو فڕۆکەیەی کە پیشانیشتدام هی منە.

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (٣٠٠٠دینار